**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب: کەری تۆپیو

بابەت : رۆمان

نوسینی: عەزیز نەسین

وەرگێڕانی : عەلی حەمەدی برایم

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم ۲۰۰۸

شوێنی چاپ : چاپەمەنی هێمن

تیراژ : ۱۰۰۰ دانە

نرخ: ۲۵۰۰ دینار

ژمارەی سپاردنی ( ۵۷۸ ) ساڵی ( ۲۰۰۸) ی پێدراوە

"نامەی یەکەم"

" کەرەکە باسی تۆپینی خۆی دەکا"

برای زۆر خۆشەویستم "مێشە کەرانە"....

دڵنیام کاتێك کە ئەم نامەیەت پێدەگات، پڕ بە دەم هاوار دەکەی " ئەی هاوار کەری تۆپیو چۆن نامە دەنوسێ"؟

لەبەر خۆتەوە دەڵێی:نای کە کەرێکی بێ چاو و ڕوو بوو.

سالانێکی دوور و درێژ بناو گوێ و بن گوێیم درێشە هاژن کرد،کەچی ئێستا بێ شەرمانە نامەم بۆ دەنوسێ، خوای گەورە دەبێ ئەو لە چ گۆڕێکەوە سەری هەڵدابێتەوە؟ زۆر سەیرە! خۆ دەمێکە تۆپیوەو بووە بەوریانی حازری.

دڵڕان مەبە "مێشە کەرانەی"هاوڕێم من لەگۆڕستانەوە نامەت بۆ دەوسم، ئەمە دوایین نامەی من نابێت، ئەگەر پەلە نەکەی و ئارام بگری هەوو مانگێك نامەیەکی منت لەگۆڕستانەوە پێ دەگات. بەڵێ لێرەوە لەگۆڕستانی ئاژەلان هەر ئاوا چەند سەد مەترێك دوور لەگۆڕستانی ئادەمیزادەکان، ئەوانەی کەچەند سالێك لەژیاندا پیاوی گەورە و ناودار و بەهێز بوون هەموو لێرەن، بەڵێ لێرە گۆڕی دەیان شاعیر و نوسەر و هونەرمەندی لێیە، کە لەژیان دا نرخی کەرێکیان نەبوو، نان نەبوو بیخۆن،هەر لەخۆڕا ڕاوەدوویان دەنان، دوای مردنیان هەموو چلە و سانەیان بۆ دەکرێ. ئاخ مێشە کەرانە نازانی ئێمە چەند زیندوو کوژی

مردوو پەرستین "مێشە کەرانە" باوەڕت بێ مردن ئەوە نییە کە لەژیان دا نەوەندەی لێ دەترساین، هەر کەمردی لەهەمووی خۆشتر ئەوەیە کە زیندووەکان دەڵێن بە ڕاستی بە مردنی زیانێکی گەورەمان لێ کەوت، هەرگیز جێگای پڕ نابێتەوە. بۆ هەتا هەتایەش لەدڵی زیندووەکاندا دەژی. ئەوەی یەکجار خۆشە کە ڕاستەوخۆ لە دوای مردنت هەستی پێ دەکەی ئەوەیە کە کاروباری گۆڕستان بە شێوەیەکی خێرا و زۆر ڕێك و پێك بەڕێوە دەچێ و هیچ دام و دەزگایەکی دەوڵەتی لێ نییە.

"فەرمان بەر"هەر ناویشی نابیستی لێرە دامەزراوە دەوڵەتییەکان نین،تا بە کارە ناشیرین و هەڵەکانیان دڵی مرۆڤەکان بتەقێنن.بۆ نمونە کە تۆ ویستت نامەیەك بۆ هاوڕێیەکی خۆشەویستت بنوسی پێویست ناکات سەردانی وێستگەی پۆستە و گەیاندن بکەی هەر بە خێرایی تیشك ئەوەی بە خەیاڵ و مێشکی تۆدا دێ لە پستەی جوان و بیرۆکەی ورد ڕاستەوخۆ لە مێشك و هەستی هاوڕێیەکەت دا دەچەسپێ.سەرسام مەبە مێشە کەرانە ئەم نامەیەی من شێوەیەکە لەو نامانە.

مێشە کەرانەی زیندوو،لێرەدا دەمەوێ باسی مردنی خۆمت بۆ بکەم.ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان کە ژیان بێزاری کردی و ویستت خۆت لە ناو ببەی یان لەبەر پیری و نەخۆشی لە مردن نزیك ببیەوە،کەڵك لەو باسە وەربگری.ئاوا من مردم،مردنی بە ڕاستی و لە ڕیزی زیندووەکاندا نەمام،نەك وەك ئەوانەی لە ژیان دا کە تیونویان بوو.هاوار لە شاگردی گازینۆیەکان دەکەن:ئاخ مردم خێرا شەربەتێکی ساردم بۆ بینە

دەزانم دوو کەس لە دنیا بە دڵ بۆم دەگرین،یەکەم فالەی هاوەنمە کە هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیتوانی جەمە ئالیکێکم بداتێ، پەی لێر بم کە

سالأنێك بوو دەست و پێی خۆی و ماڵ و منداڵی بووم.دووەم نالەی کورتان دوورووە،سور دەزانیٚ کە هەرگیز ئەو پەنجا لیرەیەی دەست ناکەوێتەوە کە بە قەرز دوا کورتانی میراتیمی بۆ دروو بووم دەشیزانی کە ئەو برە پارەیەی کە مانگانە لە قالەی خاوەنم دەستی دەکەوت بە هێزی شان و ملی من پەیدای دەکرد.

مێشە کەرانەی خۆشەویست:کاتیٚ کە بڕیارم دا بمرم گەورەکەی خۆم هەڵبژارد،بەلاٚم کە بیرم کردەوە مردن لەسەر جێگا و لە ناو نوێن سەر شۆڕییە وازم لە مردنی ماڵەوە هێنا.

ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە من لە هەموو ژیانم دا نەمتوانی تەنها جارێك کاتێکی خۆش لە یەکێك لە هاوینە هەوارەکانی وولاٚتەکەم بە سەربەرم.بۆیە بڕیارم دا بڕۆم بۆ یەکێك لەو شوێنە خۆشانە بمرم.منیش وەك پشیلە کێوی کە کاتی مردن هات دەچێتە شوێنێکی لاچەپ تا دوژمنەکانی بە بینیتی لاشەکەی خۆشحاڵ نەبن.ڕووم کردە جێگایەکی کراوە و جوان و دڵگیر کە بەسەر لێواری دەریادا دەیڕوانی.

پێش ئەوەی بمرم داوام لە خۆم کرد،دوا ئارەزوت لە ژیان دا چییە؟بیڵیٚ تا بۆت جێبەجیٚ بکەم.لە قولاٚیی ناخمەوە هاوارێك هەستا،ژیان،ژیان بە خۆمم وت واز لەو داواکارییەت بێنە.بۆ دواجار پێت دەڵێم دوایین داواکاریت چییە؟چونکە هەمیشە ئەوانەی حوکمی لە سێدارەدانیان بە سەردا دەسەپێنن ئەو پرسیارەیان لیٚ دەکەن.بەگەر دواکارییەکی ئاساییت هەیە فەرموو داوای کە.دیسان لە ناخێکی قوڵتر هاوارێکی بەرزتر،ژیان،ژیان.

ئای مێشەکەرانەی گەواد،بەسەری تۆ دنیا ئەوە ناهێنێ بەرێزت دەیان ساڵە لە بن کلکی ئەسپ و لا ملی کەری دێز دەژی و دەرزییان تێ دەچەقێنی،چیت بە چی کرد..ها؟

هەر کە گیانم دەرچوو،چاوەکانم لەسەر یەك دانان،بە ئارەزووی خۆم قاچەکانم لێ ڕاکێشا و مردم.

یەکەم ڕێبوار کە بە لامدا تێپەڕی تۆزێك لێم ورد بووەوە لەقەیەکی لە بەر ورگم کوتا تۆزێکی تر لێم ورد بۆوە و بە نوکی پێی لمبۆزی بەرز کردمەوە کە زانی هەستم لێ بڕاوە،دەستی کرد بە پشکنینم،ختووکەم دەهات،پێم وابوو لە سەعات و جزدان و ئەنگوستیلە دەگەڕا،هەر ئەبێ چەرخێکی گران بەها یان قتووە جگەرەیەکی دەست کەوێ زۆرە،ئەوەندەی نەمابوو لە قاقای پێ کەنین دەم.دانم بە خۆمدا گرت من کە مردووم چۆن دەبێ پێ بکەنم دوای ئەوەی کابرا هیچی لە گیرفانەکانمدا دەست نەکەوت نە پارە،تەنانەت قەڵەم پاندانێکیش لەقەیەکی لە لاچاوم دا و ڕۆشت بە ڕاستی پیاوێکی خاوەن ویژدان بوو،چونکە من مردووم دەیتوانی شتی خراپتریشم لەگەڵ دا بکا.

تۆزێك ڕۆیشت تووشی ڕێبوارێك بوو.

دەزانی لەو سەر ڕێگایە مەیتێك کەووتوە؟

بۆ ناچی پۆلیس ئاگادار کەیتەوە؟هەرچەندە زۆر زەحمەتە پۆلیسیش هیچی لە بارەوە بزانێ چونکە هیچ ناسنامەیەکی هەڵ نەگرتووە

ڕێبوارەکە گووتی خێراکە با بڕۆین،ئێستا بە یەك چرکە پێت دەڵێم کێ یە.

گووتی:ئێمە پۆلیسین،پۆلیس!هیچ شتێك لە ئێمە شاراوە نیە

باوەرت بێ ئێمەی پۆلیس:

لە موو هوو دەردێنین.

باشە بەڵام چۆن؟

تۆ ڕاوەستە ئێستا وای لێ دەکەم قسە بکا.

بەخوا سەیرە!مردوو قسە بکا؟

ئەوە نهێنی کارەکەی منە،هەموو کەس دەتوانێ زیندوو بخاتە قسە بەڵام من مردووەکان دەهێنمە قسە.تەنانەت کفن دزەکان وا لێ دەکەم کە لەبەر هات و هاواری مرووەکان نەتوانن بە ڕۆخی گۆڕستانەکاندا بڕۆن چ جای ئەوەی کفن بدزن.

پۆلیسەکە دوو جار سەرەو بنی کردم و چەند پارچە شیعرێکی لە گیرفانم دەرهێنا.

ئای خۆ ئەوە شاعیرە،دەزانی وا باشە لێ ی گەڕێم و بە دەنگی نەهێنم.

ئەوە شاعیرە،شاعیر،بکەرێتە قسە نەك بە من بە پۆلیسی حەوت دەوڵەت بێ دەنگ ناکرێ.دەستی کرد بە خوێندنەوەی شیعرەکان کابرا بە پۆلیسەکەی گووت:

دەزانی من هیچ لە مانای ئەو شیعرانە تێ نەگەیشتم؟براله ئەوە شیعری نوێن! نە تۆ و نە باوکی پۆلیس و نە جەماوەر لە مانای ئەو شیعرانە تێ ناگەن.دەبێ بیان دەمە پۆلیسی بەشی سیاسی تا ماناکانیان لێك بدەنەوە و بزانن کە دژی دەوڵەت نەنوسراون؟دوایی پۆلیس و ڕێبوارەکە هەر یەکەیان قاچێکیان ڕاکێشام و خستیانمە چاڵێکەوە.

بەڵێ:"مێشە کەرانە"ی بەڕێز و زیندوو من بەم شێوەیە مردم،بەڵام پێت وایە مردن لە وولاتی ئێمە هەر وا شتێکی سوك و ئاسانە؟باوەڕ بکە با

بمری ئەگەر جارێك لە لە دایك بونت پەشیمان ببیەوە هەزار جار لە مردنەکەت پەشیمان دەبییەوە.

ئێمە هەرچەند لە کات و شوێنی دیاری کراو لە دایك بوین،بەلأم کە بمانەوێ بژین ناهێڵن،کە بمانەوێ بشمرین هەر ناهێڵن.چاوەرێ بە لە نامەی داهاتوومدا بۆت باس دەکەم کە لە دوای مردنم چیم بەسەرهات.سلأو و ڕێزم بۆ هەموو ئەوانەی کە لێم دەپرسن،بەلأم تکام وایە جێگا و شوێنی من بەو "مێشە کەرانە" مەڵێ کە هاوڕێتن نەکا بزانن و خۆیان بمرێنن، بە خۆیان و درێشە تیژەکانیان بێنە هەمان گۆرستان و دەرزی ئاژنم کەن و حەسانەوەی ئەو دنیام لێ تێك دەن.

بۆیە دەڵێم ناو نیشانی من مەدە بە کەس لە کۆتایی دا دەرزییە تیژەکەت ماچ دەکەم.

دڵسۆزت

((کەری تۆپیو))

((نامەی دووەم))

## ((باسی گواستنەوەی تەرمەکەی بۆ ))
## ((خەستەخانە بە ئۆتۆمبیلی))
## ((فریاکەوتن))

مێشە کەرانەی خۆشەویست:

لە نامەی پێشوم دا بۆم باس کردی کە چۆن مردم.یان باشتر وایە بڵێم چۆن هەردوو قاچم لیّ ڕاکێشا و خۆم کرد بە مردوو،کێشەکان لێرەوە دەستیان پێ کرد دوای ئەوەی کە پۆلیس و ڕێبوارەکە جێیان هێشتم هەر ڕێبوارێك کە لە نزیکمەوە ڕەت دەبوو لای دەدایە سەر تەرمەکەم تا وای لیّ هات خەڵکێکی زۆر لەسەرم کۆ بوونەوە.یەکێك هاواری کرد ئەریّ ئێوە چۆن بنیادەمێکن؟کەسێك لەبەر چاوتان مردووە کەچی موچورکێك بە دڵتان دا نایە یەکێکی کە هاواری کرد تۆزقاڵێك شەرەفم نەبیّ ئەگەر لەم وولاّتە بمێنم و،ئەڕۆم بۆ هەندەران کە ئەوەی ناوی مرۆڤایەتییە لەم وولاّتەدا نییە.

تەنانەت هاوکاری مردووش ناکەن.

ئەوەی تەنیشتی پێی گوت:ئەی تۆ بۆ هاوکاریمان ناکەی؟ئەی تۆ مرۆڤ نی؟یا بە تۆ محاسەبەی خۆت بکە واز لە من بێنە.

- جا تۆ چوزانی؟من کارم هەیە دەنا هەر ئێستا دەچووم خەستەخانەم ئاگادار دەکردەوە.

- ئەی کە کارت هەیە خێرە سەعاتێکە لێرە وەستاوی؟

تا دەهات قەرەباڵغییەکە زیادی دەکرد و دەنگ و هەراش بەرزتر دەبووەوە.

- ئەرێ کاکە لە ناو ئەو هەموو حەشامەتە دکتۆرێکتان تێدا نییە؟

- دکتۆری چی؟برادەر دیارە ئاگات لە حاڵی ڕۆژنامەکان نییە.ڕۆژ نییە هەواڵی کۆچی چەند دکتۆرێك ڕانەگەیێنن کە بەرە و ئەورووپا و ئەمریکا کۆچ دەکەن.

یەکێك هاواری کرد:دە باشە کەسێك بڕوا لەو نزیکانە تەلەفونێك بکات. دیار بوو ئەوەیان زۆر بە ویژدانە کە دەیگوت:ئەی هاوار خوای گەورە لە بەرچاوی ئەو هەموو خەڵکە دەمرێ،کەسێك ناتوانێ تۆزێ یارمەتییەکی بدا.ئای دادپەروەری،کوا دادپەروەری؟ئاخ ئەگەر شتێکی ئاوا لە ئەورووپا ڕوویدەدا،دەتانبینی،یەکێکی کە گوتی:بابە قسەی قۆڕ مەکە بۆ پێت وایە دادپەروەری لە وولاتی ئێمەدا نییە؟گوایە شارستانییەت هەر لە ئەورووپا هەیە؟ئەگەر پیاوی ئەو قسانە لەبەردەمی ئەو خەڵکە دووبارە بکەوە.

- بابە واز لەو قسە هیچ و پوچانە بێنن خەریکە دەمرێ.

- دەزانی لە ئەورووپا نوسینگەی تایبەت بەو جۆرە کارانە هەیە؟ئەگەر سەگێك بە ئاستەم قاچێکی ئازاری پێ بگا،هەر خێرا دەگەنە سەری و دەیبەنە خەستەخانەی تایبەت بە ئاژەڵان.

ئەوەی تەنیشتی هەڵیدایە:نەخێر وا نییە لە ئەمریکا و ئەوروپا کەس کاری بە سەر کەسەوە نییە.هەر کەسەو ئیشی خۆی دەکا ئەگەر کەسێك هاوار کا بۆ خاتری خوا لە تینوان خنکام کەس چۆرە ئاوێکی ناداتێ،ئەریّ بەڕێز ئێوە ئەوروپاتان دیوە؟
ئەی بەڕیزتان سەردانی ئەوروپاتان کردووە؟
من بەش بە حاڵی خۆم نەخێر..!بەلاّم لە بارەی ئەوروپاوە زۆرم شت لە خەڵك بیستووە،بۆ خۆشم شت زۆر دەخوێنمەوە.ئەی بەڕزتان؟
جەڵێ بە دڵنیاییەوە،هەر ساڵی پار ئەو ڕیکخراوە ڕۆشنبیرییەی کە من کاری لێ دەکەم،گەشتێکی بۆ دەریای سپی ناوەڕاست ساز کرد.لە ماوەی دوو هەفتەدا یۆنان و ئیتالیا و ئیسپانیا بە درێژایی و بە پانی گەڕاین.
جە ڕاست کام لەو شارانە زۆر سەرنجی ڕاکێشای؟
شار گرنگ نییە گرنگ ئەوەیە کە من ئەوروپام دیوە.لەو گەڕانەی ئەوروپام بۆم دەرکەوت کە لە ناو ئێوەدا ویژدان و چاکە کردن زۆر کەمە.بگرە هەر نییە.
بۆ نییە کاکە؟
دە ئەگەر هەیە با یەکێك لە ئێوە بڕوا خەستەخانە ئاگادار کاتەوە.
ئەزانی هەرچەند تۆ ئەوروپات دیوە بەلاّم لە هیچ حاڵی نابی وەك من بیستومە لە ئەوروپا و ئەمریکا کەس کاری نە بە مردوو نە بە زیندوو نییە.
بۆ؟

لەبەر ئەوەی وولاتی شارستانین،با پێت بڵێم لەویٚ بۆ هەر جۆرە رووداوێك رێكخراوێكی تایبەتی هەیە،تەنانەت ئەوانەی كە لە دار دەكەونە خواریٚ لەگەڵ ئەوانەی كە دەكەونە ناو گۆماو و زەلكاوەكان كۆمەڵەی جیاواز هەیە بۆ ڕزگار كردنیان.پێت وایە ئەویٚ وەك ئێرە وایە،فەرموو مردووتان لە بەر دەستدایە و هەر یەكە لە ئاوازێك دەخوێنێ كەچی پیاوێكتان تێدا نییە بروا خەستەخانەی لیٚ ئاگادار كاتەوە.

ئەكێك لە ناو ئاپۆرایا كە هاواری كرد:ئەریٚ كاكە.. دە یەكێك تۆزێك رایوەشێنیٚ بەڵكە بێتەوە هۆش خۆی.

ئەكێكی كە دەستی خستە سەر دڵم،هاواری كرد:ئۆف..ئۆف..هەزار جار بە داخەوە مرد!ئاخ خۆ تۆزێك پێش ئێستا زیندوو بوو ئای بەستە زمان خۆ مرد!...

هەستە لە تەنیشتی ئەو ئاخ و ئۆفەی ناویٚ،هەموو گیانلەبەرێك پێش ئەوەی بمریٚ زیندووە.

تا دەهات ئاپۆرایەكە زیادی دەكرد ئەوانەی دواوە خۆیان هەڵدەبڕی و لەسەر شانی ئەوانەی بەردەمیان سەیریان دەكرد هەوڵیان دەدا بزانن چی رویداوە.ئەگەر دەمزانی بە مردنی كەسێك خەڵكی ئەوەندە سەرقاڵ دەبن و ئاوا مشت و مڕی لەسەر دەكەن دەچووم لە باخێكی گشتی نزیك شەقامێكی سەرەكی دەمرد،ئێستا من كە بەڵێنم بە خۆم داوە كە بمرم خۆ ناكریٚ ڕاست ببمەوە و بڕۆم بۆ باخێكی گشتی،دیارە سەر شۆڕییە لە بەردەم ئەو هەموو حەشاماتە لە بەڵێنی خۆم پەشیمان ببمەوە.ئەوانەی لە پێش هەموویاندا هاتوون ناڕۆن زیاتر تامەزرۆی

دەنگ و باسن لە بارەی مردنی منەوە.منالێك لەبەردەم پیاوێکدا وەستابوو کە دەستی لەسەر شانی ژنەکەی دانا.بوو.پیاوەکە بە نارەزایی دەربڕینەوە:

بە ڕاستی لەم زەمانە گەورە و بچوکی نەماوە بۆیە دەوڵەمەندەکان لە دەرەوەی شار باغ و ڤێلا دروست دەکەن تا منداڵەکانیان تێکەڵاوی منالّی نەمرۆ نەبن.فەرموو بەقەدەر بنە مۆمێکە هاتووە لە بەردەمی من وەستاوە،بە ڕاستی گەورە و بچوکی لە وولاّتی ئێمە باری کردووە.

مێشە کەرانەی خۆشەویست:زیاتر لە شەش کاتژمێر لەو چاڵەدا کەوتم.ڕۆژ بەرەو ئاوا بوون دەچوو،دەزانی من بۆ لەو شوێنە دا مامەوە؟چونکە ئێمە کۆمەڵگایەکین گیانی هاوکاری و یامەتیمان تێدا نییە.ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو کەچی هێشتا دانە دانە و دەستە دەستە خەڵك بۆ تەماشای من دەهاتن.یەکێك دەیگوت:ئای بەستە زمان ئەوە فەرمانبەر بووە لە بەر کەمی موچە و داخی گرانی و خەمی کرێیچێتی مردووە.

یەکێك دەیگوت:بە گوێرەی چڵکی یەخەکەی و سەر دەستەکانی دڵنیام شاعیرە،یەکێك دەیگوت:ڕەنگە مامۆستا بێ لە داخی تەمبەڵی قوتابییەکانی و ئەوەندەشی وانەی زیادە گوتۆتەوە گیانی لە دەست داوە.

لە پڕ لاوێکی شیکی قات لەبەر پەیدا بوو،هەر لە دوورەوە دەستی ڕادەوەشاند و هاواری لە خەڵکەکە دەکرد:ئەرێ دەڵێی لە ژیانتاندا مردووتان نەدیوە؟شورەیی ناکەن ئاوا لە سەر سەری وەستاون؟هیچ نەبێ ڕێز بن.

جا چۆن ریز بین.

ده وەرە خۆت مەکوژە..!نازانن ریز بن.دیارە قوتابی نەبوون،سەربازیتان نەکردووە"بۆ جارێکیش بێ بەردەمی دوکانی نانەواتان دیوە

خێرا دوان دەستیان کرد بە ریز کردنی خەڵکەکە.لورە لوری ئوتومبێلی فریاکەوتن هەستا.گەشتنە لامان و دوان دابەزین،بە پەلە منیان خستە سەر دەستە بەریەك،لەو کاتەدا پیاوێك بە پەلە و بە پەشۆکاوی دڕی بە خەڵکەکە دەدا و بەرەو لای من دەهات.

لاچن کاکە،ڕێم کەن برا،جێم کەن با بیبینم.

بوو بە دەنگە دەنگ،ئۆخەی ئەوا کەس و کاری پەیدا بوو،ڕێی کەن با بێتە سەری،با دیدار ئاخری نەبێ.

ئەرێ براڵە ئەوە کەس وکاری تۆیە؟

نەخێر هەر نایناسم.

ئەی بۆ وا پەشۆکاوی؟

بڵێم چی تاوێك پێش ئێستا گوتیان تەرمێك لەو ناوە کەوتووە منیش وەك ئەو خەڵکە هاتووم چاوێکم بە تەرمەکە بکەوێ.

فڕێیان دامە ناو ئۆتۆمبێلەکە،تا چەند مەترێك مناڵە وردەکە دوامان کەوتن،خەڵکەکە وردە وردە لە پێش چاوم ون بوون.

مێشە کەرانەی بەڕێز،لە نامەی داهاتومدا باسی گەشتەکەمت بۆ دەکەم.گەشت بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن.سڵاو و ڕێزم هەردوك چاو و دەرزییە تیژەکەت ماچ دەکەم.

دڵسۆزت

((کەری تۆپیو))

((نامەی سێیەم))

((کەری تۆپیو باسی گەشتەکەی خۆی دەکا))
((بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن))

ئازیزەکەم مێشە کەرانە:بە سلاوی گەرم و ماچی درێشەکەت دەست پێ دەکەم،بۆم باس کردی کە چۆن مردم و فڕێیان دامە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنەوە.لە پڕ ترسێکم لێ نشت وامزانی لە تاکسیدام،هەر ئێستا داوای کرێی تاکسیم لێ دەکا.ئەی هاوار چی بکەم.باش بوو بیرم کەوتەوە کە مردووم. ٥٠٠ مەترێك نەڕۆشتین کە ئۆتۆمبێل دەستی کرد بە پرتە پرت.لە پێش دا شۆفێرەکە لەلووت بەرزییەکەوە دابەزی و بۆنیتی هەلدایەوە و.هاتەوە پشت . سوکانەکە و جارێکی کە دابەزییەوە.کە هیچی بۆ نەکرا لە خەلکەکەی کە لە دەوری ئۆتۆمبێلەکە کۆ ببونەوە تورە بوو.ئەرێ چییە؟لەم وولاتەی ئێمە خەلك لە هەموو شتێك کۆ دەبنەوە.دەلێی هەمووتان بێ ئیش و کارن.تکایە کەس نەوەستێ،هاتەوە پشت سوکانەکە.بەلام ئۆتۆمبێل دەیگوت قەدی دارە و لە زەوی چەقیوە بە هیچ شێوەیەك لە شوێنی خۆی تەکانی

ئەدەخوارد.جیّ گرەکە بە شۆفێرەکەی گووت:دەتەویّ ئەم قەرەباڵغییەت لەکۆڵ بکەمەوە؟

ئەی بۆ نا؟

جێگرەکە کە هاواری کرد هۆ خەڵکینە،براکانم مردوومان پێیە بەڵکە پاڵێکمان پێوە نێن،دەی براکانم بڵکە بگەینە شەقامی سەرەکی.ئەوەندەی بڵیّ یەك و دوو کەس بە دەوری ئۆتۆمبێلەوە نەما.جێگرەکە دیسان ووتی خەمت نەبیّ ئێستا ولیان لیّ دەکەم پاڵ نێن.بە دەنگی بەرز هاواری کرد،ئەی خەڵکینە گوێتان لیّ بیّ کیّ خوای گەورەی خۆش دەویّ با بیّ پاڵ نیّ ئەوەی خواشی خۆش ناویّ با لێرە نەوەستیّ هەر هەموو خەڵکەکە بەرو ئۆتۆمبێلەکە رایان کرد و دەستیان کرد بەپاڵ'نان.بەڵام چونکە بە دڵ پاڵیان نەدەنا ئۆتۆمبێل یەك بست لە شوێنی خۆی نەجولا.دەی کاکە پاڵ نێن،هەموو هاواریان دەکرد،یەك،دوو،سیّ دەی خێرا دەی پاڵ نێن دەی برای دینی ئەو پاڵەیان بۆ خودایە.بەڵام بیّ کەڵك بوو بە هات و هاواری کە دەیان کرد دەتگوت ئێستا پاڵ بە ئۆتۆمبێل دەگرن و دەیگەننە خەستەخانە، بەڵام باوەرت بیّ بەو هەموو خەڵکە نەیان توانی هەنگاوێك ئۆتۆمبێل بەرەو پێش بەرن.

شۆفێرەکە کە ملی دەرهێنا بوو:دەی کاکە هەر تەکانێك بخوا دەکەوێتە ئیش و بۆ خۆی دەروا پیاوێکی پیر لە دوورەوە دستی راوەشاند و هاواری دەکرد:پاڵ نێن باوکەکەم،کورینە پاڵ نێن،بە قایم بە قایم ئەتان بیستووە خوای گە رە دەڵیّ:لە ئێوە حەرەکەت لە من بەرەکەت.پاڵ نێن ئەوەیان بۆ خوایە دەی براکانم کیّ خوای خۆش دەویّ با پاڵ نیّ.

یەکێك لەوسەر بە فیزێکەوە سەیری خەڵکەکەی دەکرد گووتی:ئەگەر ئەم ئۆتۆمبێلە لە ئەمریکا با وەك باڵندە دەفڕی،بابەئەوە خۆ دوو ساڵ بە سەر مۆدێلەکەیدا تێنەپەڕیوە،ئاخ ئەگەر بە دەستی خاوەنی خۆیەوە دەبوو،بە پەنجا ساڵێ کە وای لێ نەدەهات.نازانم ئۆتۆمبێل بۆچی لە وولاتی ئێمە وەك کەری دێز جەنە دەگرن.وەك کەری بۆز قاچ لە زەوی دەچەقێنن بە سەد تێلاَ و نەقیزە ناجوڵێن.دووان بە پەرۆشەوە گوێیان بۆ گرتبوو.یەکێکیان گووتی:برا گیان قسەکەی تۆ زۆر ڕاستە.کابرا وورپا بووەوە بە پۆزشێکەوە گووتی:کوڕینە بیرم دێ ساڵێك دەوڵەت کەشتییەکی کڕی بۆ هات و چۆی هاووڵاتییان بۆ ئەورووپا بە هۆی سەرما و بەستەڵەك ئەو کەشتییە تەنها ساڵێك کاری کرد.پێم سەیرە دەوڵەت بۆ بە گوێرەی کەش و هەوای وولاتی خۆمان ئامێرەکان ناکڕێ.بەڵێ ئەو قەسەیەی تۆ زۆر ڕاستە ئەو پاسانەی لە خەتی گەڕەکی ئێمە کار دەکەن هیچ گەڕکێك ڕازی نابێ سواریان بن لەبەر دووکەڵ و تەقە تەق.یەکێك بە تووڕەییەوە:کاکە واز لەو چەنەبازییە بێنن.وەرن ئێوەش تۆزێك پاڵ نێن،هەر لە قسەی زللتان داوە.

دەی کاکە:یەك،دوو،سێ ئۆتۆمبێل جەنەی گرتووە و ناڕوا.کاکە:دەترسم ئۆتۆمبێلەکە لە گێڕ بێ.

یەکێکی کە هاواری کرد:براینەبەسە،هیلاك بووین وەرن دانیشین با سەر و جگەرە بکێشن.

سەرو جگەرەیان کێشا،شۆفێرەکەچۆوە پشت سوکانەکە،خەڵکەکەش لەبەرئەوەی هەموویان خوایان خۆش دەویست دووبارە بەرەو پشتی ئۆتۆمبێل چوونەوە.لە ناکاو پیاوێکی قات و بۆینباغ لەبەر پەیدا

بوو.زۆر بە لوت بەرزییەوە بە شۆفێرەکەی گووت دابەزە،دەی خێرا،خێرا دابەزە.کاکە بۆ دابەزم نەڵێم دابەزە ئاخ نازانم بۆ لەم وولاتەی ئێمە کەس کۆنترۆڵی کاری خۆی پێ ناکرێ.شۆفێرەکە دابەزی و کابرای قات لەبەر چووە شوێنەکەی،چەند جارێك سولفی لێدا بەلام ئۆتۆمبێل ئیش ناکا،ملی دەرهێنا و لە حەشاماتەکەی ڕاخوڕی:کوڕە ئەوە بۆ وەستاون پاڵ نێن دەی خێرا.خەڵکەکە بە بێ ئەوەی بزانن ئەو پیاوە کێیە،وەك مێروولە کە کلۆ شەکریان بۆ دانرابێ بە پەلە لە پشتی ئۆتۆمبێلەکە خڕ بوونەوە.بوو بە هەرا و هۆریایەك هەر مەپرسە.دەی کاکە،دەی براکەم،ناوی خوای لێ بێنن دەی چاوەکەم.کە دڵسۆزی ئەو خەڵکەم دی منیش گەرم داهاتم،هاوارم کرد:دەی براکانم هەر ئەو تەکانە باش بوو،خەڵکەکە لەبەر هاوار هاواری خۆیان کەس گوێی لە من نەبوو،دەنا دەیان گووت ئەو پیاوە چەندە دڵسۆزە بە مردووییش هاوکاری زیندووەکان دەکات.ئۆتۆمبێل کەوتە جوڵە جوڵ تا دەهات خێراتر دەڕۆشت تا گەشتینە سەرە و خوارێك لانسی وەرگرت و زۆر خێراتر ڕۆشت.شۆفێر و خەڵکەکە دەتگووت بە دوای قاوانباردا ڕادەکەن.کە جار جارە ئۆتۆمبێلەکە تەکانێکی دەدا کابرای پیرە لە دواوە هاواری دەکرد:دەی..دەی ئیش کە،کابرای قات لەبەریش قوڵی لە جامەکەوە دەرهێنا بوو بە دەم نەرمە گۆرانییەوە دەیوت:ئای نیشتمان چیت لێ هات،ئای ویژدان بۆ کوێ چووی،ئای ڕاستی بۆ جێت هێشتین ئای دەست پاکی بۆ ماڵ ئاواییت لێ کردین،شۆفێر لە پێش هەموویان و خەڵکەکەش بە دوایدا لە تەنیشت ئۆتۆمبێلەکەوە وەستان.شۆفێرەکە

گووتی: ماموستا زۆرمان ئەزیەت دای دیارە ئیش ناکات،بابە چۆن ئیش ناکا!دەی کورینە پاڵ نێن کەس نەڵێ هیلاکم.
بۆ جاری دووەم شۆفێر و جێگرەکە و خەڵکەکە دەستیان کردەوە بە پاڵ نان بەلاّم چۆن پاڵێك.گەشتینە سەرەو لێژییەکی یەکجار سەخت خەڵکەکە دەستیان لێ بەردا،ئۆتۆمبێل بە شێوەیەك سەربەرە و خورا بۆوە بنیادەم سامی لێ دەکرد.لە پڕ وەك ناپاڵم بتەقێ زرمە هەستا و دواوەی ئۆتۆمبێل خۆی کێشا بە دارتێلێکی قەراغی جادەکە و کەوتە ئیش هەر خێرا شۆفێر و جێگرەکەی خۆیان هەڵدایە ناو ئۆتۆمبێل.کابرای قات لەبەر دەستی کرد بە لێخوڕین بە زەوق و گۆرانی گوتنەوە لەم شەقام بۆ ئەو شەقام.بابە ئەگەر عەقڵ بخەیتە کار شت هەیە لەو جیهانەدا کۆنترۆڵ نەکرێ.گەشتینە نزیك پارکێك.ئۆتۆمبێلەکەی وەستاند،دابەزی و دەستی ڕاوەشاند،بای،بای زۆر سوپاس من هەر خۆم دەهاتم بۆ ئێرە.دووبارە شۆفێرەکە چۆوە پشتی سوکان و بۆی دەرچوو.مێشەکەرانەی ڕەزا گران لە نامەی داهاتووم باسی ئەو سەیرانە خۆشەت بۆ دەکەم کە بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن کردمان.

لەگەڵ ڕێزمدا

تامەزرۆت

(( کەری تۆپیو ))



((نامەی چوارەم))

مێشە کەرانەی ئازیز:

لە نامەی پڕ گوڵاوی پێشومدا عەرزم کردی:کە دواوەی ئۆتۆمبێلەکە بەر دارتەلێکی قەراغی جادەکە کەوت.ببورە داویی زانیم کە دار تەل نەبوو.بەڵکە مرۆڤێکی نەگبەت بوو.بەستەزمانە لە ترسی ژیانی خۆی چەند مەترێك هەڵاتبوو بۆ قەراغی شەقامەکە،خەڵکێکی زۆر دەورەیان دابوو.دەتگووت گا لەو ناوە سەربڕاوە،ئەوەندەی خوێن لەبەر ڕۆیبوو.یەکێك بە دەنگێکی قەبەی ناخۆش ووتی:بە ڕاستی ئەو پیاوە بەخت دارە،تەماشاکەن لە جیات ئەو هەموو ئۆتۆمبێلەی لەو شارەدا هەیە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن لێی داوە کاکە باش نییە ترێلەیەك یان سەیارەی خۆڵەکە لێی نەداوە.ئەو بریندارەشیان بە بێ هۆشی هەڵدایە ناو پشتی ئۆتۆمبێلەکە.شۆفێر و جێگرەکەی بە پەلە چوونە پێشی ئۆتۆمبێلەکە.پێش ئەوەی دەرچین پیاوێك گەیشتە نزیکمان،سەیرێکی خوێنە ڕژاوەکەی کرد،تەماشای ئەو خوێنە گەشە کەن،کەلە خەڵکەکەی پرسی:ئەرێ نالێن کێیە؟

له جامی ئۆتۆمبێلەکەش تەماشای بریندارەکەی کرد.له پڕ هاواری کرد:بە شەرەفم کەمالی خوێن بەخشە،ئای کەمالی بەستە زمان.یەکێکی کە گووتی:بە ناموسم منیش ناوی ئەو کەمالەم بیستووە.دەڵێن زیاتر لە هەزار بوتڵی خوێن داوە بە هاوولاتیان،چی بکا هەژارە ژیانی ماڵ و منداڵی بە خوێن فرۆشتن دابین دەکرد.یەکێکی کە گووتی:بەخوای گەورە منیش لە بارەی ئەو کەمالە شتێکم بیستووە،دەیان گووت هەر کە ئاوی دەخواردەوە لە لەشیدا دەم و دەست دەبوو بە خوێن بەرەو شەقامی سەرەکی کەوتینە ڕێ،جێگرەکە بە شۆفێرەکەی گووت:لە پێش دا کارەکانی تۆ بکەین یان ئەوانەی من؟

شۆفێرەکە گووتی:من تا سەرێکی ماڵی خاڵم نەدەم ناچمە هیچ شوێنێك.ئەری کاك (فەرید)تۆ بۆ ئەوەندە ماڵی خاڵت خۆش دەوێ؟

فەرید گووتی:گێلەی نەعلەتی تۆ هیچ لە بارەی ماڵی خاڵمەوە دەزانی؟تا ئەو پرسیارە لە من بکەی؟

نا،بەلام زۆر بۆیان سوتاوی.گوێبگرە بێ عەقڵ،ئێستا لە ڕێگەی پارکی گەورەوە دەتبەم بۆ ماڵی خاڵم،بۆ ئەوەی تا دەتوانی لەو ڕێگا بەرزەوە سەیری دیمەنی جوان و ڕازاوەی شار بکەی.

مێشە کەرانە:ڕێگای خەستەخانە بوو بە ڕێگەی گەشت و گوزار،بۆ من ناخۆش نەبوو،بەلام کابرای بریندار حاڵی شڕ بوو.

فەرید ئاخێکی سارد و سڕی هەڵکێشا و گووتی:گوێت لێ بێ!دایکم من و دوو خوشکمی هەبوون،هەردووك لە من گەورەتر بوون.ئەوان زوو شویان کرد و بردیانن بۆ لادێ،بە کوڕی شەریف و جوتیار،هەردوو زاوایەکەشمان خزمی خۆمان بوون،براله ئێمە بە ڕەچەڵەك لادێین باوکم

خوا عافوی کا هەتا مردیش دەیگووت:ڕەز و بەراوم لە دێیەکەی خۆمان ماوە،کوڕی خۆم خزمەکانم دەیخۆن.فەرید بەردەوام بوو:دوای چەند ساڵێك باوکم عومری دریژی بۆ تۆ بەجێ هێشت.ماینەوەمن و دایکم.خاڵم ماڵی ئاوا بێ لە ژێر خانی خانووە گەورەکەی خۆیدا هۆدەیەکی داینێ لە کۆڵ کرێچێتی کردینەوە.دایکم هاوکاری خاڵۆژنمی دەکرد لە ماڵەوە.منیش لە بازاڕ لەگەڵ خاڵم کاری کڕین و فرۆشتنی دانەوێڵەم دەکرد.لەگەڵ کچە گەورەکەی خاڵم خۆشەویستییەکی پاك و بێگەردمان لە نێواندا بوو.خاڵیشم حەزی دەکرد ببیا بە من،بەڵام ئاخ لە دەست لوت بەرزی،خاڵۆژنم من و دایکمی بە چاوی خزمەت کار و کارەکەر تەماشا دەکرد.بۆیە هەر سێ کچەکەی دان بە سێ کوڕی دەوڵەمەندبە بێ ئەوەی پرس بە خاڵم و کچەکانی بکا.خاڵۆ ژنم لەو جۆرە ژنانەیە کە لە ماڵەوە کەس ناتوانێ قسە لە قسەیدا بکا.بەڵام بە داخەوە کە ئێستا هەر سێ کچەکەی بێ وەژنن و لە ماڵەوەن.

مێشەکەرانەی درێشە تیژ:ئەو بەسەرهاتەی فەرید و ڕازانی ناو ئۆتۆمبێل و دیمەنی سەوز و پڕ دارستانی شار،خۆشی و سەیرانێکیان بۆ من دروست کردبوو،لە ژیانم دا ساتی وا بێ دەنگ و ئارامم نەدیبوو.لە پڕ زرمە هەستا،ئۆتۆمبێل خۆی کێشا بە درەختێکی گەورەی سەر شۆستەکەدا.نەمزانی چۆن ئەو هەموو خەڵکە لە کوێوە هاتن و دەورەیان داین.فەرید و جێگرەکەی دابەزین،دەرگای دواوەیان کردەوە خەڵك بە سەرمان وەربوون،جێگرەکەی سەیری هەر چوار دەوری لای ئۆتۆمبێلەکەی کرد و گووتی:لام وابێ سەلامەتین،سوپاس بۆ خوا کە بە ساغی دەرچووین.

ئەریٚ مێشە کەرانەی خۆشەویست پێت وا نییە ئەگەر بمزانیبا ئەو کارەساتەم بەسەر دیٚ قەت دەمردم.دەبیٚ چ ڕووداویٚ تالٚ و ناخۆشی کە چاوەڕێم بن.
مێشە کەرانە ئیتر بەسە هیلاك بووم تۆشم هیلاك کرد.لەگەلٚ سلاٚوم هیوای سەرفرازی و بەختەوەریت بۆ دەخوازم.

زۆر زۆر تامەزرۆت

((کەری تۆپیو))

.((نامەی پێنجەم))

هاورێی خۆشەویستم:

مێشە کەرانەی زیندوو:لە نامەکانی پێشومدا،باسی مەرگەساتی مردنم بۆ کردی کە چەند ناخۆش و پڕ سەر ئێشە بوون.لێرەدا نامەویٚ ورەت بروخێنم.لێم گەڕیٚ با بەسەرهاتی خۆمت بە ڕاستی و دروستی بۆ تەواو بکەم،دوایی چۆنت پیٚ خۆش بوو وا بکە.بۆم باس کردی کە چۆن دواوەی ئۆتۆمبێلەکە بەر درەختێك کەوت.

سوار بوونەوە،چەند مەترێك نەڕۆشتین کە فەرید بە جێگرەکەی گووت:دەزانی بەنزینمان لیٚ برا.ئەی چی بکەین بۆ خاتری خوا؟ئێمە مەیتێك و بریندارێکمان پێیە هەروا خوێن لەبەری دەڕوا.ئای بەنەعلەت بی شەیتان،فەرید گیان با ئۆتۆمبێلێك ڕاگرین هیچ نەبیٚ بریندارەکە بگەیەنێتە خەستەخانە.فەرید گووتی:دەزانی تۆ زۆر کەری؟هەتیو ئۆتۆمبێل چۆن لێرەدا ڕادەوەستیٚ؟بۆ هەر لەبەر هێندیٚ پارە؟نا..لەبەر ئەوەی کەم شۆفێر هەیە بریندار بەریٚ بۆ خەستەخانە.نا..ها..تا ئۆتۆمبێلەکەی خوێناوی نەبیٚ.ڕوژە ڕوژ ئۆتۆمبێل بە لاماندا تێدەپەڕین بە بیٚ ئەوەی هەر ئاوڕیشمان لیٚ بدەنەوە.مێشە گیان لە پڕ ئۆتۆمبێلێکی زۆر خێرا دای بە لاماندا فەرید و جێگرەکەی خۆیان

هەڵدایە سەر شۆستەکە.خەریك بوو هەردووکیان هەلا هەلا کا.جێگرەکە گووتی:دە باشە با تەکسییەك ڕاگرین.هەتیو تاکسی بشوەستێ کە چاوی بەو برینداره کەوێ دەڕوا.گوێت لە من بێ:من پێش ئەوەی لە خەستەخانە دابمەزرێم شۆفێری تاکسی بووم،تاکسییەکە هی خاڵم بوو،هەم نیش و کاری ماڵ و عەمبارم پێ دەکرد.هەم کرێش.لە دوای شووکردنی خۆشەویستەکەم و مردنی دایکم ماڵی خاڵم بە جێهێشت.ماوەیەك لە ئوتێل خەوتم،ڕۆژێك توشی کۆنە هاوڕێیەکم بووم کە لە یەکێك لە گەڕەکە هەژار نشینەکان ژوورێکی بە کرێ گرتبوو.منی بردە لای خۆی و گووتی:فەرید دەستێ نوێن بکڕە.منیش ئەوەی لە میراتی ماڵەکەی دایکم بۆم بەجێ مابوو لە ژێر خانەکەی ماڵی خاڵم دەرهێنا،هێندێکم فرۆشتن و ئەوەی بە کەڵکم هاتن بردمن بۆ ئەو ژووره.ماوەی سێ چوار مانگ دوو قۆڵی ژیانێکی گەلێك خۆش و بێ کێشەمان لەو ژووره بچوکەدا بەسەر برد.شەوێکیان هاوڕێیەکەم نەهاتەوە،بەیانی کە خەبەرم بووەوە سەیرم کرد لە تەنیشتم دانیشتووە،جانتایەکی بچوکی لەسەر باوەشی داناوە.هەر کە هەستام و بەیانی باشم لێ کرد.گووتی:فەرید،هاتوومەوە خواحافیزیت لێ بکەم شتەکانم هەمووی بۆ تۆ.کرێی دوو مانگیشم لە ژوورەکەدا داماوە ئەویش هەر بۆ تۆ.ئەملا و ئەولای یەکترمان ماچ کرد،بە پەلە لە ژوورەکە چۆ دەرێ،ڕۆیی بەرەو هەندەران.ئێستاشی لەگەڵ بێ نەمزانی گەیشت،نەگەیشت،تێدا چوو.بە هەر حاڵ خوا بیپارێزێ،یادی بە خێر.براله من هەتا ئێستاش لەو ژوورەدا بە تەنیا دەژیم.زۆر لە کچە عازەب و قەیرەی گەڕەك دەیان ویست کە شووم پێ بکەن بەڵام پێم

ئالێی بە چی ژن بێنم؟چۆنی بەخێو کەم؟ئەو کات من ماندەری یانەی (فەنار بەھجە)بووم.ئەگەر کەسێ یان چەند کەسێ دەھاتن دەیان ویست بیانبەم بۆ یاریگە بە تایبەتی ئەو ڕۆژانەی کە یانەکەی خۆمان یاری هەبا بۆ بێجگە لە ماندەری یانەی (فەنار بەھجە)کەس حەدی ئەوەی هەبوو پێ بخاتە ناو تەکسییەکەی منەوە؟دار و دیواری ناو تەکسییەکەم وێنە و ئالآی یانەکەم بوو.جێگرەکە گووتی:باشە ئەو هەموو ئۆتۆمبێلە جوانە لایان داوەتە قەراغی ڕێگا،بێ ئیش و بێ کار وەستاون،دەڕۆم داوا لە یەك دوانێك دەکەم بەڵکە بە دەنگمانەوە بێن.فەرید گووتی:بێ عەقڵ ئەوانە کەسانێکن لە بەرزترین چینی وولاتی ئێمەن.ئێستا هەر یەکەو بە کاری جێ بە جێ کردنی ئارەزووەکانی خۆیەوە خەریکە ئەو شۆفرلێتە نابینی بە تەنیا کوڕ و کچێکی تێدایە،ئەی ئەو خانمە تەڕ پیرە نابینی لە پشتی سوکانەکەیەوە چاودێرییان دەکا ئەوەش لاوێکی ترە بە تەنیا،ئەو ((جێب))ە تازەی پێیە،نابینی چەند منداڵە؟بڕوانە بیرە دەخواتەوە.کەرە ئەو چینی دەوڵەمەندەکانن ئەوەندەی ئەبرد ئۆتۆمبێلێکی تازەی فریاکەوتن دەرکەوت،دەستیان لێ ڕاگرت وەستا کە بریندارەکەی دی گووتی:بم بوورن دەچم بۆ وەرگرتنی بەنزین دوایی دێمەوە بۆ لاتان لە کۆتاییدا تەکسیەکیان وەستان،تۆزێك لە دیمەنەکە ڕاما:بەخوا بریندار سوار ناکەم لەبەرئەوەی حەوسەڵەی دادگا و پۆلیسم نییە فەرید گووتی:باشە تۆ هان دەری کام یانەی؟شۆفێری تەکسییەکە گووتی:یانەی ((فەنار بەھجە)). جێگرەکە گووتی:باشە بە ڕیشی تۆ ڕەوایە یەکێك لە باشترین یاریزانەکانی یانەکەت برینداربێ،باڵی ڕاستی یانەکەش بی هەنگاوێك تا خەستەخانەی نەگەیەنی؟بەخوا ماندەری

چاکی،هەرچۆنێك بێ شۆفێری تەکسییەکە ڕازی بوو.بە هەرسێکیان بریندارەکەیان خستە ناو تاکسییەکە.
مێشە کەرانە  بە شەرفت هەقم نییە ئەگەر بمرم و کۆتایی بە ژیانم بێنم،هەرچەندە من تا ئێستاش بە شێوەیەکی یاسایی نەمردووم.....
لەگەڵ جوانترین سڵاوم

((کەری تۆپیو))

((نامەی شەشەم))

هەردوو چاوەکانم:مێشە کەرانە

وەکو باسم کرد برینداەکەیان خستە تاکسییەکەوە بەڵێ خاوەن تاکسییەکەیان هەڵ ٠خەڵەتاند.منیشیان لە لای قاچی برینداەکە دانیشاند وەکو زیندوو،فەریدیش لە پێشەوە دانیشت.کەواتە ئێستا لە تەکسییەکەدا ٣ زیندوو بەك بریندار دانیشتوین کە نازانین گیانی تێدا ماوە یان نا.بەڵام بەش بە حاڵی خۆم لە ڕیزی مردووان دانراوم.شۆفێری تاکسییەکە گووتی:بە ڕاست،بۆنی مردوو دێ!

فەرید وەڵامی دایەوە:هەر بۆنی مردوو؟ئەی بۆ ئەو گەرمایە ناڵێی؟دار و بەرد سور بۆتەوە هەڵاوی ئۆتۆمبێلەکەش سەربار و بن بار.بگەینە خەستەخانە وا دەزانن ئەو دووانە سوتاون.گەشتینە مەیدانێك خەڵكێکی زۆر چوار ڕیز وەستابوون،کۆتایی ڕیزەکان دیار نەبوو،تومەز شوێنی تاقیکردنەوەی بەڵگەنامەی شۆفێری بوو.

لە نزیکمانەوە هاوارێك هەستا:نەرێ بەخوا بورایەوە،پۆلیسێکی هاتو چۆ دەستی لە ئێمە ڕاگرت:بوەستە کورە،ئەم نەخۆشە لەگەڵ خۆت ببە بۆ خەستەخانە.بەستەزمانە لە گەرمان بوراوەتەوە.

ئەو بێ هۆشەشیان ئاخنییە لای ئێمە لەبەرئەوەی زۆر قەڵەو بوو فزەی لە من و بریندارەکە بڕی.مێشە کەرانە ئێستا ٣ کەس لە دواوەن،مردوویێک.بریندارێک،بێ هۆشێک. شۆفێری تاکسییەکە گووتی:دەبێ پلەی بورانەوەی ئەو پیاوە چەند بێ؟هەر خێرا پیاوە بێ هۆشەکە ڕاست بۆوە و ڕووی کردە شۆفێرەکە:بۆ بورانەوەش پلەی هەیە؟کەوتە چەنەبازی،کاکە تۆ ئاگات لە دنیا نییە ئێم ئەمڕۆ لە کوێ ٣٠٠کەس کە تاقی کردنەوەیان ئەنجام داوە ٣کەس دەرچوون یەکێکیان من بووم بۆ پێت وایە سەردەمی ئێوەیە؟هەر لە خۆڕا ڕوخسەتی شۆفێریتان بدەنێ؟دیار بوو کابرای بێ هۆش پیاوێکی چەنەباز بوو،لە سەر قسەکانی ڕۆشت:با پێت بڵێم ئێستە کۆمەڵێک ڕێگە بە پێچا و پێچی ناتوانی بە نێوانیاندا بڕوا و چەند دانەیەك نەخا.فەرید گووتی:ڕاستە،پیاوی زۆر وریا و شارەزا نەبێ ناتوانی بە نێوانیاندا بڕوا ئافەرین برادەر،وایە؟دیارە تۆش تازە مۆڵەتی شۆفێریت دەرهێناوە.شۆفێری تاکسییەکە تووڕە بوو ئلوڕێکی لە کابرای چەنباز دایەوە و گووتی:ئای دونیا،بە شەرەفم سەدی وەك تۆ وەك و دەسکە شتل بە دەستمەوە دەگرم و وەك و مەرمزە دەتان چێنم،سەماش بە تاکسییەکەم دەکەم.کابرا گووتی:برا خۆ ناڵێم تۆ دەرناچی،دەردەچی بەلاّم بە زەحمەت..!شۆفێری تاکسییەکە چەند پەستی ڕۆژگار و گرانی و ئەشیای یەدەگ بوو،ئەوەندەش پەستی گەرمایەکە بوو،قسەکانی کابرای چەنەباز ئەوەندەی کە پەستیان کرد.ئلوڕێکی لە کابرا دایەوە و گووتی:نەك بە نێوان ئەو پایانەدا زۆر باش بزانە من ئەو تەکسییەی خۆم بە سەر پردی سیراتیشدا دەپەڕێنمەوە.ئیدی بیکە بە خاتری خوا

لەود زیاتر چەنەبازی مەکە،ئەگەر پیاوی وەرە گرەو بکەین،تۆ جارێك ئۆتۆمبێلەکەت ڕەت کە من حەوت جار تەکسییەکەم ڕەت دەکەم.دەئەگەر ناموست هەیە،دە وەرە حەوت بە یەك،دە وەرە گرەو بکەین.

مێشە کەرانە:شۆفێری تاکسییەکە چەند تووڕەتر دەبوو زیاتر پێی لە بەنزین دەنا،دەتگووت تاکسییەکە باڵی گرتووە.کابرای چەنەباز گووتی:کاکە گیان ڕایگرە،بە قوربان ڕایگرە من دادەبەزم شوکور بۆ خوا باشترم،ڕایگرە کاکە دوورم مەخەوە،پێویستم بە دکتۆر نییە،کاکە لەسەرخۆ بە.

شۆفێرەکە زیاتر پێی لە بەنزین نا...!

لەسەر خۆ کاکە،برا من لە قسەی خۆم نەك جارێك حەفتا جار پەشیمان بوومەوە.

شۆفێری تاکسییەکەش وەك ئۆتۆمبێلی پۆلیسی پیٚ بیٚ و ڕاوە دووی تاوان باران بنیٚ تاکسییەکەی بۆ لای ڕاست و چەپ دەشکاندەوە زۆر بە خێرایی خۆی دەکرد بە نێوان دوو ئۆتۆمبێلدا.هەرچی هونەری خۆی هەیە هەمووی بەکارهێنا.ئەوەندەی بەملا و ئەولادا داین وەك چێشتی مجێوری لیٚ کردین.لە ناکاو شڵپەیەکی زۆر گەورە هەستا،شتێکی زۆر گران کێشای بە سەرمدا،دوو جار ئۆتۆمبێلەکە چۆ پێشەوە و هاتەوە دواوە،دیتم عەمودێك لە ناوەڕاستی تەکسییەکە چەقیوە.کابرای چەنەباز وا شێوا بوو کە نەیدەزانی چی ڕووی داوە،لەبەر خۆیەوە وڕێنەی دەکرد و دەیگووت:باشە خۆ کە من سوار بووم ئەو عەمودەی لێرە نەبوو ئەی چی هێنایە ئێرە؟شۆفێرەکە لە جامی تاکسییەکە پەڕی بوو چەند مەترێك ئەولاتر کەوتبوو،هەردوو ئەژنۆی لە ورگی گیر

کردبوو،هاواری دەکرد:بە شەرەفم حەوت جار، لە جیاتی یەك جاری تۆ حەوت جار.
مێشەکەرانەی خۆشەویست لەبەرئەوەی جێگاکەمان ئاوەڕاستی شار بوو خێرا پۆلیس گەیشتە سەرمان تاکسییەکی کەیان ڕاگرت،ئێمەیان خستە ناو تاکسییەکە.وردە وردە بەرچاوم تاریك بوو،ئاگام لە خۆم نەما،هەستم کرد کە یەکجاری مردم،لێرەدا کۆتایی بە نامەکەم دێنم.داوای لەش ساغیش بۆ تۆی بەڕێز دەخوازم
برات

((کەری تۆپیو))

((نامەی حەوتەم))

## کەری تۆپیو باسی هۆی مردنی خۆی))
((دەکا))

براکەم و هەردووك چاوم: مێشە کەرانە بزانە چۆن بە ڕاستی و بێ پەردە باسی مردنی خۆم بۆ کردی،بەڵام باسی هۆی مردنی خۆم بۆ نەکردووی.باش دەزانم کە تۆ ڕستەی کورت و پڕ مانای گەورەت دەوێ.بیرت دێ جارێك لە کاتی بێ کاریم دا،هاتمە لات و داوای یارمەتیم لێ کردی.بەو زمانە پاراوەی خۆم لێت پاڕامەوە بەڵام قروشێکم لە تۆ دەست نەکەوت.

زانایەك دەڵێ:(دەبێ بزانی لە چ کاتێکدا داوای شت لە بەرامبەرەکەت دکەی)) نازانم ئەم ووتەیە هی مۆلێرە؟ڕۆبسپێرە؟یان هیتلەرە؟یان مەشهەدی جەعفەرە؟ئەوەندە دەزانم کە دووایین پیتی ناوەکەی پیتی ڕێیە.بەڵێ چاکت بیر دێ،کە هاتم سەرم دانەواند و ئەوپەندە بەرزەم بۆ خوێندییەوە،بەڵام هەر بە خەیاڵیشت دا نەهات.تا ووتەیەکی خۆمم چرپاند بە گوێتا،دەستت کرد بە گریان و هەرچی لە گیرفانتدا بوو دەرت هێنا و دات پێم.خۆ ئەگەر بت زانیبا ئەو ووتەیە هی خۆمە،لەم گوێیەت دەچۆ ژووری ولەو گوێیەت دەچۆ دەرێ.چونکە پەندی

کەسایەتی خۆمان ئەگەر گەوهەریش بێ نرخی بەردێکی نییە.چونکە بایەخی قسە لەلای ئێمە بە گوێرەی بایەخی قسەکە نییە بگرە بە گوێرەی جێگای بەرز و نزمی قسەکەرەکەیە.

واتە ئەگەر دووکەڵ کێشێك بشکێ،قرچە قرچ و تەقەِ تەقەکەی وەکو موعجیزەیەکی خودایی وایە.لە سایەی خواوە.دوای جێهێشتنی ئەو ژیانە بەدفەڕە تێگەشتم کە دوو جۆر مرۆڤ هەن.

جۆری یەکەم:شێتەکانن هیچ لێپرسینەوەیەکیان لەسەر نییە.

جۆری دووەم:پاشا و لێپرسراوەکانن.

مێشە کەرانە:وای دانێ من یەکێك بام لە سەرۆکی یەکێك لەو وولاتانە.دەیانگووت لەبەر ئەوەی سەرۆك مەعدەنەکەی زۆر چاکە لە چاکترین مەعدەن پەیکەریان بۆ دەکردم.خۆ ئەگەر دەمم ،کردبایەوە باوێشکێك بدەم،تێکڕا دەیان ووت:ماشاالله لەو باوێشکە جوانە.دواییش لە دەرەوە هەوڵیان دەدا لاسایی باوێشکەکەم بکەنەوە...

ئاگات لێ بێ ئێمە ڕۆژی چەندین قسە دەکەین و بە هەزاران واتای بە نرخ و بە کەڵك بە فیڕۆ دەدەین.هەروەکوو چۆن پارە و ژیانیشمان هەر بە فیڕۆ دەڕوا.

پێم نەگووتی کە پەندی جوان لای ئێمە نرخی بەردێکی نییە.گوێت بێنە با وتەیەکی زۆر بەکەڵکت بە گوێدا بچرپێنم.لە دایك بوون خۆشە بەڵام مردن زۆر ناخۆشە.تۆ لە لایەن کەسێکی کەوە لە دایك دەبی بەڵام دەبێ هەر خۆت بە تەنیا بمری.هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بمرم.منیش وەك هەموو مرۆڤەکان ژیانم خۆش دەویست.ڕۆژێك

دوای پەنجا لیرەی پێشینەم لە بەڕێوبەرەکەم کرد.پێی ووتم بۆچیتە؟بە مێشکم دا هات بڵێم.کەمێك کاغەزی پێ دەکڕم و فڕۆکەیەکی پێ دروست دەکەم.

ووتم:قەرزاری کابرایەکم لە تۆی وەردەگرم و دەیدەمەوە بەو.کەی؟ئەمڕۆکات ژمێری دووی دوانیوەڕۆ بۆی دێ.باشە ئەو کاتە وەرە تا پەنجا لیرەکەت بدەمێ.ئەی نابێ ئێستا بمدەیتێ؟نەخێر نابێ!بۆ؟لەبەرئەوە تۆ سەری دوو پەتت بۆ ئاگاتەوە بە یەك و لەو شتانە نازانی.تۆ بیر لەوە ناکەیتەوە کە خاوەن قەرزەکەت پێش کاتژمێری دوو بمرێ؟مانای ئەوەیە تۆ ڕزگارت دەبێ لەو پەنجا لیرەیە.بەخوا قوربان من ئەوەندە بەخت دار نیم لەوانەیە پێش ئەو کاتە من بۆ خۆم بمرم.ئێ بۆ خراپە بەو جۆرەش هەر تۆ ڕزگارت دەبێ.

مێشەکەرانە لە دڵی خۆمدا ووتم من پیاوێکی نەگبەتم دەترسم تا ئەو کاتە بەڕێوبەرەکەم بمرێ هەرچەند تەمەن بە دەست خوای گەورەیە.ئەوسا من چی بکەم؟کاتژمێر یەك و نیو چوومەوە بۆ لای بەڕێوبەر بەلاّم بە کارێکی پێویست فەرمانگەی بەجێهێشتبوو منیش پێش کاتژمێری دوو باریکەم دایە و لە فەرمانگە وەردەرکەوتم.کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ بیر و هۆشم باشە من بە دەیان هاوڕێی ڕەوشەن بیر و خاوەنی بیر کردنەوەی ئازادی خوازی و دڵسۆزم هەن.ئەی نەبوو؟لەو شەوانە لەگەڵیان دانیشتبووم هەموویان پێکەکانیان لێك داو هەڵیان بڕی،هاواریان کرد:بژی یەکسانی،بژی دادپەروەری.

چووم بۆ ماڵی یەکێك لەو هاوڕێیانەم.کە چووم میوانێکی زۆری هەبوو.بانگ هێشتنی کردبوون بە بۆنەی دەرچوونی بە سەرۆکی

دەزگایەکی رۆشنبیری گەورە.بەسەرهاتی خۆم و بەرێوبەرەکەم بۆ گێرانەوە،ئەوەندە پێکەنین.کچێك ئەو پێکەی بە دەستییەوە بوو لێی رژایە ناو ملی ئەو پیاوەی دەستی خستبۆ سەر شانی

هەرچەندە من قوڵپی گریان لە گەرومدا بوو،یەکێك هاواری دەکرد:بە راستی بەسەرهاتێکی خۆش بوو.یەکێك بۆ ئەوەی رادەی رۆشنبیری خۆی بۆ میوانەکان دەربخا بە ئینگلیزی دەگووت:ئۆ.."سەر پرایز".بەڵێ من لە داخا خەریك بووتەنگە نەفەس دەبووم.کەچی ئەوان زیاتر قاقایان لێ دەدا و پێ کەنینیان پێ رانەدەوەستا.

ئافرەتێکی زۆر جوان کە بەرامبەرم دانیشتبوو دەستی کرد بە گریان،گووتم ئۆخەی ئەو ئافرەتە ویژدانی جولا و دەرونی منی خوێندەوە دەسرەکەی دەرهێنا و دەستی کرد بە فرمێسك سرین،هاواری کرد:ماڵت بە قور نەگیرێ ئەوەندە پێکەنیوم هەردووك چاوم پڕ بوون لە ئاو.

هاوارم کرد:بە چی پێ دەکەنن؟کورە بێ قەزا بی بەو بەسەرهاتە خۆشەی کە تۆ گێراتەوە.

هەستام و چوومە دەرێ،لەودیو دەرگاکەوە گوێم لێ بوو یەکێکیان بە دەم پێکەنینەوە دەیگووت:بە راستی پیاوێکی قسە خۆش بوو،هاورێیەکەم رووی کردە میوانەکانی:نەتان ناسی کێ بوو؟گوتیان نەخێر!گووتی:ئەوە ئەو نوسەرەیە دەنوسێ تا خەڵك بگریەنێ بەڵام بە نوسینەکانی پێ دەکەنن ئەوە عەزیز نەسین بوو...

هەردووك چاوەکانم مێشە کەرانە:

خۆت باش دەزانی ئەمامەتییەکانی ژیان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە[illegible]م
کەڵەکە دەبوون.کاتێک دەمویست لای یەکێک لە هاورێیەکانم باسی
ئەداری خۆم بکەم و ڕاز و نهێنییەکانی خۆم دەربڕم.ئەوان دەبوو بۆ
بەسەرهاتەکانی من گریابان نەك پێبکەنن.هیوام وایە بە دەرزییە
تیژەکەت پێوەیان بدەی و ئازاریان پیٚ بگەیەنی.

هەردوو باڵە ڕەنگا و ڕەنگەکەت
ماچ دەکەم لە ژێر تیشکی خۆردا

لەگەڵ خۆشەویستیمدا

((کەری تۆپیو))

(( نامەی هەشتەم ))

مێشە کەرانەی خۆشەویست:
دوای ئەوەی کە گەشتینە بەردەمی یەکەم خەستەخانە،وامزانی ئیدی کێشەکان کۆتاییان هات.
پێت وا نەبێ لە نامەکانمدا زیادە ڕەویم کردبێ،دەربارەی مردن و مردوەکان،نا..تەنها دەمەوێ ترست لە مردن بشکێنم.دەبێ وات لێ بکەم کە ئەو ڕۆژەی دەمری وابزانی لە ماڵی خۆتانەوە دەچی بۆ سەیرانێکی قەراغ شار.هەر بە ڕاستیش وایە،کاتێ هیچ گیانلەبەرێك ناتوانێ لە دەستی مردن ڕزگاری بێ،ئیتر مردن ئەو ترس و لەرزەی بۆ چییە؟مێشە گیان.با بێینەوە سەر باسی گەشتەکەمان،لە ڕێگا ئۆتۆمبێلەکە ئاوی تێدا نەما،چەند ئۆتۆمبێلێکمان ڕاگرت هەریەك بە بەهانەیەك ئاویان نەدایێ شۆفێرەکە بە سواڵەتە لەتێك لە گۆمێك کە لە نزیك جادەکە بوو بە پێنج شەش جار هات و چۆ ڕادێتەرەکەی پڕ کردەوە لە ئاو.وەك و عەرزم کردی گەشتینە بەردەمی یەکەم خەستەخانە،کاتێ دەست پێ کردنی دەوامی فەرمان بەرەکان بوو.لە پێشدا بریندارەکە و دوایی منیان داگرت،لە حەوشەکە لە تەنیشت یەك درێژیان کردین...سستەرێك هاتە سەرمان،ڕووی لە شۆفێرەە کرد:ئەوانە لە کەیەوە وایان لێ هاتووە؟لە دوێنێوە.ئەی لەو کاتەوە لە کوێ بوو؟بە ئاخێرتان تازە دەیان

هێنن بۆ خەستەخانە؟ئەوەتا یەکێکیان مردووە و ئەوەشیان بە حاڵ گیانی تێدا ماوە.دووبارە سستەرەکە رووی لە' شۆفێرەکە کردەوە:بە راست ئەو برینداره لە دوێنێوە ئاوا خوێنی لەبەر دەڕوا؟شۆفێرەکە گووتی:تۆ چیت دیوە دوێنێ بریندار بوو دیبات وەك جۆگەلە خوێنی لەبەر دەڕۆیی.

لەبەرئەوەی دکتۆری خەستەخانەکە هەر ئەم بەیانییە سەفەری کردبوو بۆ هەندەران،بە پەلە سواریان کردینەوە و بەرەو خەستەخانەیەکی تریان بردین.هەر کە گەشتینە دووەم خەستەخانە بە پەلە برینداره‌کەیان داگرت،منیان لە ئۆتۆمبێلەکەدا بە جێهێشت.دکتۆری خەستەخانەکە پێی گووتن:لێرە هیچ پێداویستییەکمان نییە بۆ دروونەوەی برینەکانی و دەرزی ((خوێن وەستان))یش تەواو بووە...بە پەلە بیگەیەننە خەستەخانەیەك کە ئەو شتانەی هەبێ،دەی باوکەکەم خێرا،خێرا با نەمرێ...

لە ڕێگا شۆفێری تاکسییەکە بە فەریدی گووت:کەی کرێیەکەم دەدەیتێ؟فەرید کە شەو نەخەوتبوو بە دەم باوێشکەوە وەڵامی دایەوە:دوو سێ ڕۆژی تر لە خەستەخانەی شارەوانی وەری دەگری.

مێشە کەرانەی زیندوو:کە گەشتینە سێیەم خەستەخانە،لە بەختی برینداره‌کە دکتۆر و سستەر و دەرمان و پێداویستی تەواو لە خەستەخانەکە دا هەبوون.

تەنانەت دکتۆرەکە بە فەریدی گووت:بە ڕاستی شەنستان هەبوو هاتن بۆ ئێرە،کە ئەمڕۆ هەموو شتێك تەواوە....کوا لە وولاتی ئێمە خەستەخانەی بێ کەم و کوڕی هەیە؟کە ویستیان ناوی برینداره‌کە

تۆمار بکەن،ناو نوسەکە !ە شوێنی خۆی نەمابوو دکتۆرەکە گووتی:دەی خێراکەن ناوەکەی تۆمارکەن و ببیەنە ژووری نەشتەرگەری.فەرید گووتی:باشە دەیبەینە ژووری نەشتەرگەری دوایی ناوەکەی تۆمار دەکەین.یەکێك لە فەرمانبەرەکان تووڕە بوو:بابە بە بێ تۆمار کردن چۆن دەیبەنە ژووری؟ئەی چۆن پێداویستی و دەرمانی بۆ بنوسین؟

کاتێ گیرفانەکانی گەڕان بریندارەکە ناسنامەی پێ نەبوو...سەرۆکی برین پێچەکان گووتی:گوێتان لێ بێ:ئێمە لیستی تۆمارمان هەیە راپۆرتی مانگانە لەسەر ئەو لیستە دەنوسین.گوبێ بگرە کاکی شۆفێری تاکسی هەتا پارەی تۆش لەسەر ئەو راپۆرتە خەرج دەکرێ.دکتۆرەکە لێیان هاتە پێشەوە.بە تووڕەییەو گووتی:ئەو هەموو مشت و مڕەی ناوێ،کابرا لە دوێنێوە بریندارە و خوێنی لەبەر دەڕوا،سستەرەکە گووتی:گەورەم خۆ ئەگەر خۆشت بتەوێ نەشتەرگەری بۆ بکەی دەزگای ((وێنە تیشکییەکەمان)) لە دوێنێوە شکاوە.بە پەلە بریندارەکەیان بەرەو تاکسییەکە هێنایەوە.لە پڕ دوو ئۆتۆمبێلی پۆلیس بە لورە لور و گلۆپ هەڵکردن دەورەی فەرید و شۆفێری تاکسییەکەیان دا،میلی دەمانچەیان ڕاکێشا و هاواریان کرد:نەجولێن کوڕە خێرا دەستتان هەڵبڕن.

فەرید بە دەم دەست هەڵبڕینەوە:کاکە چیە بۆ ئێمە چیمان کردووە وا دەورەتان داوین؟چیتان کردووە سەگبابینە..ها؟خۆتان گێل دەکەن؟کوا ئێسترەکە؟فەرید گووتی:کاکە ئێستری چی؟دەڵێم خێرا کوا؟ئێسترە،کەرە،بارگینە؟با پێتان بڵێم سەعاتێکە بە

دواتانەوەین،لایەکی شەقامەکانی شارتان کردووە بە خوێن...فێر بوون کەر و بارگین سەردەبڕن و گۆشتەکەی بە خەڵکی قوڕ بەسەر دەفرۆشن.باش بوو دکتۆرەکە ڕووی کردە پۆلیسەکان:کاکە ئەو دمانچانە لابەن،ئەو کوڕە ناوی فەریدە شۆفێری ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنی شارەوانییە...پۆلیسەکان گووتیان سەیرە کەسێك ئەوەندەی خوێن هەبێ باوەڕتان بێ بارگین سەربڕە ئەوەندەی خوێن لەبەر ناڕوا.شۆفێری تاکسییەکە بە فەریدی گووت:ئەرێ برا کرێیەکەی من،کاکە خەمی کرێت نەبێ وابزنە لە گیرفانتدایە.بریندارەکەیان سوار کردەوە و بەرەو خەستەخانەیەکی تریان بردین.

مێشەرانەی ئازیز:باوەڕت بێ لەسەر خۆمەوە بەزەییم بەو بریندارە قوڕ بەسەرەدا دەهاتەوە،لەو خەستەخانەیە بریندارەکەیان لە من جیاکردەوە،کە زانییان من مردووم بردیانمە ژێر زەمینێکەوە خستیانمە ناو دۆڵابێکی ئاسن کە هەر چوار دەوری بەستبووی...ئۆف مێشە کەرانەی خۆشەویست ئەگەر عەقڵت هەبێ دەست لەو ژیانە خۆشە هەڵ ناگری،ئەگەر باسی ئازارەکانی مردنت بۆ باس بکەم ئەوسا دەزانی کە ژیان چەند خۆشە،هەرچەندە ژیانی من و تۆ ژیانێکی کولە مەرگی بوو.بەڵام زۆر لە مردن خۆشترە بۆیە تا پێ‌ ـ‌ دەکرێ لە ژیاندا بمێنەوە...

سڵاو و ڕێزم بۆت خۆشەویستەکەم

برات

((کەری تۆپیو))

((کەری تۆپیو باسی مەیتخانە بۆ مێشە کەرانە دەگێڕێتەوە))

خۆشەویستم مێشە کەرانە:
دیار بوو کە سەرۆکی مەیتخانە لە مردنی من دوو دڵ و نیگەران بوو.بۆیە بانگی ئەو دکتۆرەی کە مەیتی منی وەرگرتبوو،داوای ڕاپۆرتی مردنی منی لێ کرد.دکتۆرەکە چۆوە بۆ ژوورەکەی خۆی و بانگی سەرۆکی برین پێچەکانی کرد،لێی پرسی:ئایا شێوەی مردنی من چۆن بووە،ووتی گەورەم من لەسەر قسەی فەڕاشەکە بەتۆم ڕاگەیاند چونکە ئەو گووتی ئەوەیان مردووە.دکتۆرەکە گووتی با پێت بڵێم من تا دڵنیا نەبم کە کەسێك مردووە هەرگیز ڕاپۆرت نانوسم.بڕۆ بانگی فەڕاشەکە کە.فەڕاشەکە هات و بە ترسێکەوە گووتی گەورەم من لە سەر قسەی پیاسەوانەکەی بەر دەرگا عەرزم کردن کە ئەو پیاوە مردووە.دکتۆرەکە بە تورەییەوە گووتی:با پێتان بڵێم:مردوو زیندووی ئەم زەمانە هیچیان جێگای متمانە نین،ئەوەتا ڕۆژ نییە هەواڵی زیندوو بوونەوەی چەند کەسێك لە مردووەکان نەبیستین.کاتێ شۆڕیان دەکەنەوە بۆ ناو گۆڕ،یەکێك دەپژمێ،یەکێك هاوار دەکا بۆ خاتری خوا لە کوێم؟سستەرەکە بە دکتۆرەکەی گووت:زۆر ڕاستە گەورەم هەر مانگی

پێشوو بوو کە ڕاپۆرتمان لەسەر مردنی پیرێژنێك نوسی.پێش ئەوەی ئەو سەر ئاسنە گۆڕ بە گۆڕ کەن هاواری کردبوو:ئەی هاوار بۆ کوێم دەبەن،توخوا وازم لێ بێنن.

دیارە نەمردبوو ئەی چۆن ڕاپۆرتتان نوسی؟گەورەم ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە تەرمەکەمان نەدی لەسەر بوختانی بوکەکەی نوسیمان.گەورەم تا بڵێی بوکێکی جوان و ڕێك و پێك بوو،کۆمەڵێك ژنی گەڕەك و دراوسێشی لەگەڵ بوون،هەموو ژنەکان دەگریان،هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئەو بووکە جوانە شتی وا بکات.دکتۆرەکە گووتی:ئاخ...ئەوە هەموو لە ئەنجامی نەزانینە بەڵێ...نەزانین.بەڵام دەبوایە تۆ بچویتایە بۆ گۆڕستان،هەر بە زۆر ئەو پیرێژنە سەر ئاسنینەت لە گۆڕ نابا.تا خەڵك نەڵێن پیرێژنێکی مردوو ڕاست دەکات بەڵام دکتۆر و خەستەخانە و ڕاپۆرت درۆدەکەن.گەورەم:سێ چوار ڕۆژ دوای ئەو ڕووداوە بووکە جوانەکە خەسوی هێنایەوە بۆ خەستەخانە تا دەرزی لێ بدەین.لە پیرێژنەکە توورە بووم،پێم گووت:ئەوە تۆ بە سەری سپییەوە شورەیی ناکەی؟ئەو هەموو گریان و لە خۆدانەی بوکە جوان و ژنی گەڕەکت بە فیڕۆ دا.لە لێواری گۆڕەکەت هاوارت کرد.پیرێژن گووتی:ڕۆڵە گیان بۆ پێت وایە من هەر ئەو جارە مردووم؟بووکە جوانەکەم ساڵ نییە دوو سێ جار دەرمان داوم نەکات.نازانم بۆ نامرم؟سەر سەختم،یان لەسەر تاتە شۆر،یان لە کفن کردندا یان لە لێواری گۆڕستان بە هۆش دێمەوە.ئاخ نامرم،تا ئەو بووکە جوانەشم ڕزگاری بێ.

مێشە کەرانە:لەبەرئەوەی دکتۆرەکە زۆر ڕاست گۆ و بە ویژدان بوو،دیسان بای دایەوە سەر شێوەی مردنی من.بۆ ئەوەی توشی لێپرسینەوە نەبێ،تەنانەت لاشەی مردووەکەی نەدیوە.بڕیاری دا سستەرەکە و فەڕاشەکە و پاسەوانەکە بکا بە شاهید.دکتۆرەکە ڕووی تێ کردن و ووتی:هەرچەندە دوێنێ شەو نۆرە ئێشکی من نەبوو بەلاّم برۆن پاسەوانەکەش بانگ کەن.هەرسێکیان لەبەردەمی ڕاوەستان.گوێتان لێ بێ:من لەو دکتۆرانەم کە کارەکەی خۆم زۆر لا پیرۆزە،هەرگیز کەم تەرخەمی لە من ناوەشێتەوە.گوێ بگرن شەوێکیان نۆرە ئێشکی من بوو،لەگەڵ یەك دوو هاوڕێی خۆشەویست چووین بۆ یانە،شەو زۆر درەنگ هاتمەوە بۆ خەستەخانە،ئەوەندە سەرخۆش بووم قاچم ئەرزی نەدەگرت.پێیان گووتم:کە ڕاپۆرتی سێ مردوویان ئامادە کردووە تەنها ڕەزامەندی منی ماوە.بەلاّم من دەستم کرد بە پشکنین و مەچەك گرتنیان،مردووی یەکەم دڵی زۆر باش لێی دەدا!مردووی دووەم دڵی زۆر سروشتی بوو!...دیسان ڕووی کردەوە پاسەوانەکە،تۆ چۆنت زانی کە ئەو پیاوە مردووە؟جەنابی دکتۆر من سی و پێنج ساڵە دەرگەوانی ئەو خەستەخانەیەم،تۆ بڵێی مردوو و زیندوو لێك جیا نەکەمەوە.من لە ماوەی ئەو سی چل ساڵە وەك پسپۆڕی مردوانم لێ هاتووە،باوەڕکە سەیری مردوو کەم دەزانم مانگانەکەشی چەند بووە.دە مادام وایە پێم بلێ کە مانگانەکەی چەند بووە؟لە چوارسەد لێرە کەمتر بووە.چۆنت زانی؟جەنابی دکتۆر نابینی ناو قەدی هەر ئەوەندەی ملی دەبێ،ئەی ئەوە نییە هەردووك چاوی بە قوڵ دا چووە؟دیارە هەشت تا دە کەسیشی بەخێو کردووە،ئەی هەردوو شانی داچەقیوی نابینی

نیشانەی کوڵ کێشی کوڵی گرانن.بەڵام تا بڵێی پیاوێکی دانا و ژیر بوو.دکتۆرەکە گووتی:هەرچییەکت گووت قبوڵمە بەڵام چۆنت زانی کە پیاوێکی زیرەکە...ها؟لەبەرئەوەی کە هێنایانە ژووری پێکەنێنێکی زەرد لەسەر لێوی بوو دیار بوو کە گاڵتەی بە دنیا دەهات.کەواتە:تۆ شاهێدی کە مردووە.بەڵێ بەڵێ گەورەم ئەی چۆن؟دکتۆرەکە گووتی:باوەڕ دەکەی من هەتا ئێستاش لە مردنی ئەو پیاوە دوو دڵم.

بریارم دا هیچ لێ پرسراوییەك نەخەمە ئەستۆی خۆم ڕاوەنەی ((پزیشکی دادوەری))دەکەم،سەر ئێشە لە کوڵ خۆم دەکەمەوە.

باوەڕت بێ مێشە کەرانەی زیندوو:

من لەژیانمدا ئەوەندە نەترساوم...!گووتم بۆ خوایە گیان،بۆ من بووم بە معامەلەی پیاوی هەژار کە ناتوانن بەرتیلی لەسەر بدەن وا ئەم دایرە ئەو دایرەم پێ دەکەن؟بەڵێ دەینێرم بۆ پزیشکی دادوەری تا کاری هەموومان سەلامەت بێ.دوایی گووتم قیر و سیا،بۆ هەر شوێنێکم دەنێرن؟بمنێرن هەر لە خەستەخانە وەدەرێم نەنێن،بڵێن برۆ دەرەوە بە زۆریش بێ هەر دەبێ بژی.مێشە کەرانەی خۆشەویست لە نامەی داهاتووم بۆت باس دەکەم کە لە پزیشکی دادوەری چیم بەسەرهات.... .

برات

((کەری تۆپیو))

((نامەی پانزەھەم))

((چۆن کەسێکی چینی بورجوازی سەرکەوتنی بە دەست هێنا لە کوشتنی خۆی دا))

هۆ مێشە کەرانەی بەڕێز:
وەك مردن،مردووم بەڵام هەتا ئێستاش مردنی من بە شێوەیەکی یاسایی ڕانەگەیەندراوە،ژیان چەند ناخۆشە بە یاسا بژی لەوەش ناخۆش تر ئەوەیە کە بە یاسا بمری.لێرە لە ژێر زەمینی مەیت خانەی سارد و سڕدا کە پلەی گەرمی لە خوار خاڵی سفرەوەیە،کۆمەڵێك مردووی کەشی لێن.لە لای چەپمەوە لاوێکی سی ساڵە و لە لای ڕاستم پیرێژنێکی لێیە.لە لاوەکەم پرسی:گەورەم بەڕێزتان بۆ مردوون؟بۆیە وشەی گەورە و بەڕێزم بۆ بەکار هێنا،چونکە بە مردوویش گیف بوونەوە و لووت بەرزی پێوە دیار بوو.لە چینی پیاوە گەورەکان بوو.ڕووی لە من وەرگێڕا وەك و قسە لەگەڵ خۆی بکا،بە ئەسپایی گووتی:لەبەرئەوەی کە پێم خۆش بوو بمرم...!مردم بۆ ئەوەی جیاوازی چینایەتی نەبینم،تا چیتر لات و گەجەر و گوجەرەکان نەبینم پیاوە گەورەکان و دەوڵەمەندەکان بێزاکەن.

گووتم ڕاسته:لێره هەموو کەس پێکەوه ڕاکشاون گەوره،بچوك،پاشا،خزمەت کار،ئەوانەی لە لێفەی باوکی خۆیان دا تریون یان نەتریون.
بە ئەسپایی گووتی:زۆر سەیره زەلامێك پرسیار لە من دەکا،کە هەتا ئێستا دکتۆرەکانیش نەیان زانیوه کە هۆی مردنی خۆی چییه؟سدیاره لە ناو مردووەکانیش پیاوی بێ ئەدەب هەن.
لە ژنەکەی تەنیشتم پرسی ئەو پیاوه لە گەورەکانە؟دەم و دەست پەشیمان بوومەوه،کە بە بێ ئەوەی خۆم بناسێنم،کت و پڕ ئەو پرسیارەم کرد،دەنگم لە بنی میچەکەوه دەنگی دایەوه...
ئافرەتەکە گووتی:بەڵێ لە گەورەکانە،خۆی کوشتووه.گووتم:بۆ خۆ کوشتن هەر ئاوا ئاسانە؟دیسان لاوەکە تووڕه بۆوه،گوایە من خۆم لەقسەکانی هەڵقورتاندووه،لەبەر خۆیەوه زۆر بە نەرمی لەسەر قسەکانی ڕۆشت:دەزانی لە وڵاتی ئێمە خۆ کوشتن زۆر لە ژیان ئارەحەتتره.لە پێش دا بڕیارم دا خۆم بخەمە دەریاوه.هەموو کەنارەکان گەرام،بستێك شوێنی بەتاڵم نەدۆزییەوه خۆمی لێ فڕێ دەمە دەریاوه.بۆ دەوڵەمەندەکان؟بەڵێ دەوڵەمەندەکان بستێك جێیان نەهێشتۆتەوه نەیان کردبێ بە بار و گازین و ڤیلا و باغ و باغاتی تایبەت بە خۆیان؟بۆ هەر شوێنێك دەڕۆی تابلۆیەك هەڵواسراوه:وەستان لێره قەدەغەیه،چوونە ئارەوەی ئەم شەقامە قەدەغەیه!لە ڕاستی ئەم باغە ئاوڕدانەوه قەدەغەیه.ناتوانی لێرەوه بچیتە قەراغی دەریا،زۆر تابلۆی تریش لەم بابەتانە.ویستم لە کەلێنی باغێك خۆم ئاودیو کەم و بگەمە قەراغی دەریا تا کۆتایی بە ژیانم بێنم،سێ چوار سەگی پۆلیسی لێم ڕاپەڕین بە

پەلە خۆم لە دەستیان ڕزگارکرد. کرد.تۆزێکی کە ڕۆشتم داوام لە خاوەنی باغێك کرد.کە ڕێگەم بدەن لە باغەکەیانەوە بچم بۆ کەناری دەریا خۆم بخنکێنم،خاوەن باخەکە زۆری ئامۆژگاری کردم کە مرۆڤ چۆن دڵی دێ ئەو ئەو ژیانە خۆشە بە جێ بێڵێ...کچە ناسك و نازدارەکەشی کە لە ناو گوڵی باغەکەدا دەهات ودەچوو،چەنجەی بۆ گوڵە ڕەنگا و ڕەنگەکانی باغەکە ڕاکێشا،بە ڕاست چۆن دڵت دێ دنیای پڕ لە گوڵی ڕازاوە بە جێ بێڵی؟بڕیارم دا سواری کەشتییەکی نەفەر هەڵگر بم و خۆم فڕێ دەمەوە ناو شەپۆل بێ پایانەکانی دەریاوە،بەلام خەڵکێکی یەکجار زۆر خۆیان دابوو بەسەر شیشەکانیقەراغ کەشتییەکەدا.خۆیان شۆڕ کردبۆوە و سەیری دیمەنی جوانی دەریایان دەکرد،هەرچۆنێك بێ دڕم بە خەڵکەکە دا و خۆم فڕێ دا.دەم و دەست دەریان هێنامەوە.چوومە ماڵێ،شوشەیەك ژەهرم خواردەوە،بە پەلە بردیانم بۆ خەستەخانە و چارەسەریان کردم و نەیان هێشت بمرم.چەند جارێکی تر ژەهرم خواردەوە کەچی تەندروستیم پێ باش دەبوو.دکتۆری تایبەتیم گووتی:هۆکارەکەی ئەوەیە کە خوێنم بەرگری دژی ژەهرەکان وەرگرتووە.بیرم کردەوە کە نەك هەر من بگرە زۆربەی خەڵکی وولاتی ئێمە چۆن لەگەڵ ئەو ژەهرانە ڕاهاتون کە لە پاشماوەی گازی ئۆتۆمبێل و گازی چێشت لێنان دا هەن.بگرە زۆربەی ئەو خواردنەوە گەنیوانەکە لە لا کۆلان و حاوییەکاندا فڕێ دەدەن گازی ژەهراوییان لێ هەڵدەستێ،بەلام وەك و پێم گووتی خەڵك جۆرێك لەگەڵیان ڕادێن کە بەهێزترین گازی ژەهراوی کاریان لێ ناکات.

بەڵێ مێشە کەرانە:ئەوە فەرموو دەی کوڕی چینی دەوڵەمەند بوو.ئێستا لە هۆکاری کوشتنی من حاڵی بووی؟وەڵامم دایەوە:نەخێر گووتی:ژیان لە لای ئێمە شێوەیەك گران بووە کەس بەرگەی ناگرێ.لەو وولاتەی ئێمە کە س شوێنی خۆی لە ناو کۆمەڵگادا پێ دیاری ناکرێ.هەموو سەرەکان چوونە شوێنی قاچەکان،قاچەکانیش چوونە شوێنی سەرەکان.ڕۆژێك دێ ئەو کۆمەڵگایەی ئێمە سەرلاە و بن دەبێ.

ئەی چۆن خۆت کوشت؟شەوێك لەگەڵ سکرتێرەکەم لە دورگەی بسفۆر دەهاتینەوە ئەوم دابەزاند و خۆم بە ئۆتۆمبێلەکەمەوە فڕێ دایە چاڵێکەوە،خۆم لەو ژیانە بۆگەنە ڕزگار کرد.بەڵێ لە داخی ئەو کەسانەی کە سنوری خۆیان لە ناو کۆمەڵگادا نازانن.مردم بەڵام هەر ڕزگارم نەبوو،حەزم دەکرد لە ناو مردووەکانیش جیاوازی چینایەتی هەبا.ڕووی لێ وەرگێڕام و بێ دەنگ بوو...

مێشە کەرانەی خۆشەویست:

لە نامەی داهاتووم دا هۆی مردنی کەسانی تریشت بۆ باس دەکەم. چاوەکانت ماچ دەکەم.

برات

(( کەری تۆپیو ))

## ((نامەی دوانزەهەم))

### ((باسی هەڵبەستنی گۆڕێک دەکات کە شایەنی شان و شکۆی بنەماڵە بێت))

مێشە کەرانەی خۆشەویست:

نازانم نامەکانم تا کوێ تۆیان بێزار کردووە.ڕەنگە هەمیشە لە خوا بپاڕێیتەوە کە بە شێوەیەکی یاسایی بمرم و ڕزگارت بێ لە دەستم منیش لە دەست یاسای بۆگەن ڕزگار بم.

خۆشەویستم:وەك لە نامەکانی پێشوو بۆم نوسیبووی کە نە مردن و نە ژیان لە لای ئێمە هەروا ئاسان نین.ئەوەتا ئەو پیرێژنەی تەنیشتم دەڵێ:من چەند ساڵە عومری خوام کردووە کەچی هەتا ئێستا کاری یاساییم بۆ نەکراوە و نەمردووم.لەو کاتەدا پیاوێکی مردوویان لە دۆلابەکەی دەرهێنا.هەموو مردووەکان گوتیان:ئای ئەو پیاوە چەند بەخت دارە،هەمووی چوار ڕۆژ نابێ هاتۆتە ئێرە کەچی ئەوا کاری یاسایی بۆ تەواو کراوە و دەیبەن بۆ گۆڕستان...دیارە کەس و کارەکەی خەڵکی گەورە و ناسراون.گووتم:پوریێ گیان ئەوە تۆ دەڵێی چی؟بۆ مردوو بەختی چی؟کەس و کاری چی؟گووتی:ئای کوڕم تۆ تازەی ئاگاداری ئیش و کاری ئێرە نیت.من ئەو ڕۆژەی کە مردم هەر هەمان

ڕۆژ ناوی سەربازیم هاتبوود بیستوتە تا ئێستا ژن کرابێتە سەرباز؟بە دەست خۆم نەبوو پێکەنین گرتمی،گووتی:ڕۆڵە شورەییە پێ مەکەنە.نابێ ئێمە کارێك بکەین کە زیندووەکان دەیکەن.

گووتم:چوری گیان خۆ تۆ تەمەنت لە شەست ساڵ زیاترە،چۆن ناوی سەربازیت هاتۆتەوە بێجگە لەوەی کە ئافرەتی.

کوڕە شیرینەکەم تەمەنم شەست و نۆ ساڵە،ئێستا هەموو کوڕەکانم خەریکی ئەوەن کە بیسەلمێنن:یەکەم کە من ئافرەتم،دووەم کە تەمەنی سەربازیم بەسەر چووە.ئەی کە وایە بۆ کوڕەکانت کاری یاساییت بۆ تەواو ناکەن؟

کوڕم:ئەو کارەیان کرد،بە یاسا سەلماندیان کە من ئافرەتم و تەمەنم شەست و نۆ ساڵە.بەڵام نایانەوێ بەڵگەنامەی مردنم بۆ دەربێنن،چونکە بریکاری خەڵوزەکەمان بە ناوی منەوەیە،ساڵی ملوێنێك زیاتر لە فرۆشتنی خەڵوز قازانج دەکەین،خۆشت دەزانی سەرما و سۆڵەی وولاتی ئێمە چۆنە؟بەڵێ کەسی پوری،خۆ هەر من کێشەم نییە،سەیری تەرمی ئەو لاوە کە مانگێك زیاترە لێرەیە کەچی چەند ڕۆژێك لەمەوبەر فەرمانی گرتنی بۆ دەرچوو بوو،پۆلیس هاتبوون بیگرن.هەمووی تاوانی دکتۆرەکانە کە ناتوانن نە کاری زیندووەکان نە هی مردووەکان ڕێك بخەن.باوەڕت بێ سەریان لە دادگا و دەزگا دەوڵەتییەکانیکەش تێك داوە...

مێشە کەرانە:کە ئاوڕێکی لا ملم لە پیرێژنەکە دایەوە هەرگیز لە مردوو نەدەچوو ئەوەندە بە جوانی و ڕێك و پێکی قسەی دەکرد...لێم

پرسی:ئەریٚ بە ڕاست تۆ مردوی؟گووتی:وشەی مردن بۆ من بەکار مەهێنە.دیارە تۆ پیاوێکی زۆر دەبەنگی و ئاگات لە ڕۆژنامەکان نییە؟

گووتم:بەلیٚ من زۆر ئاگام لە ڕۆژنامەکان هەیە و هەمیشە چەند ڕۆژنامەیەکم خوێندۆتەوە... ئەی چۆن ئاگادارییەکانی کە لەسەر کۆچی دوایی من نوسرابوون نەتخوێندۆتەوە.بە ڕاستی ئەو هەموو نوسین و ڕاگەیاندنە جوانانە زۆر دلْ خۆشیان کردم و مردنم هەر لە بیر نەما.هەتا ئێستاش مانشێتەکان لە خەیاڵمدا دێن و دەچن لە یەکێك لە ڕۆژنامەکان نوسرابوو...

لە دەست دانی سامانێکی گەورە...

لە ڕۆژنامەکانیکەشدا هەر یەکە و بە جۆرێك.

لە دەست دانی دایکی گەورە و پیرۆزمان

"کوڕەکانی"

لە دەست دانی خەسوی گەورە و بەڕێزمان

"زاوایەکانی"

لە دەست دانی دامەزرێنەری کۆمپانیای تیشکی زێرین...

"هاوپەیمانەکانی"

کۆچی دوایی خاتوو...نەوەی پایە بەرزی((سلێمان سوڵو پاشا)) نەوەی((محمود پاشا))ی گەورە،خوشکەزای قاسم پاشای زاوای بەیرم پاشا.پێم گووت:باشە ئێمە لە دنیادا هەر شتێك بوو بین و هەر چۆنێك بە شان و باڵیان دا هەڵدابین،هەموو ئاگەڕێینەوە بۆ ژێر دەسەلاْتی خوای گەورە؟گووتی:گێژە ئەو شتانە ڕاستە کە دادی مردوو نادەن،بەلاْم لەبەر ڕیٚز و شان و شکۆی بنەماڵەکەمانە،بۆ نمونە یەکێك لەو هۆیانەی کە من

تا ئێستا لێرە ماوم،گەڕانی کوڕەکانم و زاوایەکانمە بە دوای گۆڕێکی گونجاو بۆ من کە شایستەی بنەماڵە بێ...بەڵام خۆت دەزانی کە ئێستا جێگا گۆڕ لە گۆڕستانەکان بە شێوەیەکی چەند بەر چاو و لە ڕادەبەدەر گران بووە،هەرچەندە هاو پەیمانەکانی کۆمپانیایەکەم لە بازاڕی ڕەش چەند جێگا گۆڕێکیان دەست نیشان کردبوو.بەڵام ئەگەر بۆ خۆم لە ژیان دابام دەمگووت کە هەر هەموویان بکڕن چونکە تا ساڵێکی کە نرخیان چەند بەرامبەر لە ئێستا بەرزتر دەبێتەوە...

برای ئازیزم مێشە کەرانە: خۆزگە ژیانی مردووەکان لە ژیانی زیندووەکان نزیك دەبوو،هەتا شتی باش لە مردووەکان فێر ببان.ئێستا وام بە بیردا دێ،کە دوای ئەوەی زۆر شتی باش لە مردووەکان فێر بووم.دەست لە مردنەکەم هەڵگرم پێش ئەوەی بە شێوەیەکی یاسایی مردنەکەم ڕابگەیەندرێ.بەڵام ئەگەر بێمەوە بۆ ژیان،بێجگە لە درێشە تیژەکەی تۆ و گرانی بازاڕ و قەرزاری چیتر چاوەڕێمە.ها کاکە گیان؟

هەردووك چاوت بە تاسوقەوە ماچ دەکەم...

برات

((کەری تۆپیو))

((نامەی سیانزدەهەم))

((باسی سێ مردووی سەیر))

مێشە کەرانەی ئازیز:

مرۆڤ دوای مردنیشی لە دەست زیندووەکان ڕزگاری نابێ...

جاری وا هەیە دەمەوێ پڕ بە دڵ هاوارکەم و بڵێم:وەرن لێرە دەرم بێنن،بم بەن بۆ گۆڕستان بم نێژن،بەڵام هاواری من بێ کەڵکە،چونکە زیندووەکان دەنگی مردووەکان نابیستن...دەزانم زۆر لە مردووانەی کە لێرەن،چاوەڕێی نۆبەتی خۆیان دەکەن تا بیان بەن بۆ بەشی هەڵدرین...بە تایبەتی ئەوانەی هۆی مردنەکانیان نەزانراوە...لەوانە سێ مردویان زۆر سەیرن...!یەکێکیان شەو و ڕۆژ پێ دەکەنێ،یەکێکیان زۆر بە سۆزەوە بە بێ ڕاوەستان هەمیشە دەگری،ئەویکەشیان دۆش داماوە و خەریکی بیرکردنەوەیە.لە پێش دا چووم بۆ لای ئەو مردووەی کە پێکەنین گرتویەتی،بەوپەڕی ڕێزەوە گووتم:گەورەم خێرە شەو و ڕۆژ بێ ڕاوەستان پێ دەکەنی؟

ئاخر مێشە کەرانە:پێکەنینی مردوو زۆر سەیرە،وایدانێ کەسێك لەبەر دەستت مردووە و پێکەنین گرتویەتی،زیاتر پێکەنینەکەی لەوە دەچوو کە زانایەك ئامێری پێکەنینی دۆزیبێتەوە کە بە هێزی کارەبا کار بکات

و شەو و ڕۆژ پێبکەنێ چاوەکانی ئاویان پێدا دەهاتە خوارێ بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لە نێوان قاقا و قسەکردن بەسەرهاتی خۆی بۆ گێرامەوە:باسەکە هەتا بڵێی پێکەنیناوییە ناکرێ پێنەکەنی،هەر ئەو شەوەی کە بۆ بەیانی مردم لەگەڵ هاوسەرەکەم چووین بۆ سەیری شانۆگەرییەکی کۆمیدی،کە دەمێك بوو تامەزرۆی بووین...هەر لە سەرەتای پەردە لادانەوە دەستمان کرد بە پێکەنین،چۆن پێکەنینێك؟قاقایان دەگەیشتە دەرەوەی هۆڵەکە.کاتێك سەیرێکی دەو رو بەرم کرد دیتم بێجگە لە من و هاوسەرم کەسی دی پێ ناکەنێ.ئەوەی تەنیشتم باڵی ڕاوەشاندم و گووتی:کاکە بەس نییە؟بۆ پێدەکەنی؟گووتم:پارەم نەداوە؟شانۆگەری کۆمیدییە لۆ پێ دەکەنم.دووان لەولاتر هەڵیان دایە گووتیان:شانۆگەری کۆمیدی چی؟شێت بووی؟ئەم شانۆگەرییە تراژیدیایە.نابینی بێجگە لە تۆ و ژنەکەت هەر هەموومان دەگرین؟یەکێکی کە گووتی:لێیان گەڕێن،ئەوانە دەیانەوێ پارەکەیان خەسار نەبێ.هیچ نەبێ دەبێ بایی پارەکەیان پێ بکەنن زۆرم پێ سەیر بوو کە ئەو خەڵکە بۆ شانۆگەرییەك دەگرین،کە نوسەرەکەی نوسەری شانۆگەری کۆمیدی گەپ جارە.بەڵێ من و هاوسەرم هەر بەردەوام بووین لەسەر پێکەنینی خۆمان،گاڵتەم بەو خەڵکە دەهات کە بۆ شانۆگەرییەکی کۆمیدی دەگرین.کاتی نیوە شەو کە لەگەڵ هاوسەرم گەڕاینەوە ماڵەوە...هەموو دراوسێکان لە قاقای ئێمە خەبەریان بۆوە.لەبەرە بەیان من ناو پەنچکم هەڵگەڕایەوە و مردم .تازە کوا دەتوانم پێکەنینەکەم ڕاگرم ها..ها...ها.ئەی هاوار مردم قا.قا.قا..گێژ بووم ناتوانم پێنەکەنم.ها..ها..ها..ڕووی خۆم بۆ لای ئەو

مردووە وەرگێڕا کە هەمیشە دەگریا،لێم پرسی:ئەرێ براکە بۆ وا شەو و ڕۆژ ملت بە گریانەوە ناوە؟کە گوێی لە دەنگی من بوو ئەرمەندەی کە کوڵی گریانی هەستا،وەك باران فرمێسکی بەردانەوە.بەدەم فرمێسك و چڵم سڕینەوە گووتی:کاکە گیان ئەگەر من نەگریم ئەی کێ بگریە؟توخوا لێم گەڕێ گریان هەر بۆ من باشە،پێش ئەوەی بمرم یەکێك بووم لە ئارەزوو مەندانی ڕۆژنامە خوێندنەوە.بە تایبەتی ڕۆژنامەی((ڕێگای ڕاست))لە لاپەرە حەوتی ئەو ڕۆژنامەیە گۆشەیەك هەبوو بە ناوی ((لە دەست دانی سەروەران))لەسەر مردنی کەسێك کە من نەم دەناسی پەخشانێك نوسرابوو،ئەگەر شاعیرە عەرەبەکانی سەردەمی کۆن پێداهەڵدانی وایان نوسیبێ.لە ژیانمدا نوسینی هێندە بە پێز و بە هێز و دڵ تەزێنم نەدیبوو ،نەخوێندبووەوە...

هەرچەندم دەکرد نوسینەکەم پێ تەواو نەدەکرا،فرمێسك وەکو جۆگەلەی ئاو لەسەر ڕوومەتەکانم ڕیز بووبوون.. نوسیبوی بەڵێ ڕۆژگاری چەوت ئەو مرۆڤی لێ ستاندین کە هەرگیز جێی پڕ نابێتەوە،ئەو مرۆڤە نەمرە خێرخوازە بۆ هەتا هەتایە لە دڵی کەسانی دەور و بەری هەر زیندووە و هەر دەمێنێ.کارە چاکەکانی کە ئەو نەمرە پێش کەش بە مرۆڤایەتی کردوون لە ژمارە نایەن و هەتا هەتایە کۆتاییان نایە،بە دەم گریان و هەنسکەوە کە من بە مردوویی خۆم بەزەییم پێدا دەهاتەوە دەیگووت:هەر چۆنێك بوو نوسینەکەم تەواو کرد...بە پەلە و بە دەم گریانەوە ڕامکرد بۆ نوسینگەی ڕۆژنامەکە،خۆش بەختانە چاوم بە نوسەری ئەو پەخشانە بەرزە کەوت،پێم گووت:ئەگەر بزانم پەخشانێکی ئاوا جوانیش بۆ مردنی من

دەنوسی ئێستا دەمرم.وەلأمی دامەوە:نوسینی جوان و ناشرین بە گوێرەی زۆر و کەمی ئەو پارەیەیە کە ئەمدەنێ.چەندی داوا کرد بۆ نوسینی پەخشانەکە دامێ.مردم،بەڵێ پەخشانێکی بۆ مردنی منیش نوسی.کەچی بێ ویژدانە،دوو دێڕی لەسەر من نوسیبوو کە شایستەی تۆپینی نێرە کەرێکیش نەبوو...نەك من!پێم گووت:دە باشە بەقوربان هیچی کە مەگری ئاگئات لێیە چیت لێ هاتووە،نەتزانی نووسەرەکە ناوی چی بوو؟زۆر گەڕام بە دوایدا تووشی کەسێك نەبووم ئەو پیاوە بناسێ،بۆیە هەتا هێزم تێدا بمێنێ بۆ سۆز و جوانی ئەو پەخشانەی ئەو نووسەرە هەر دەگریم.

ورده ورده چووم بۆ لای ئەو مردووەی کە شەو و ڕۆژ بیری دەکردەوە و دۆش دامابوو.لێم پرسی:ئەرێ براله هۆی چییە تۆ کە ئاوا هەمیشە خەریکی بیرکردنەوەی؟گووتی:بیر لەوە دەکەمەوە بزانم من مرۆڤم یان نا؟گووتم:بە دڵنیاییەوە بەڕێزتان مرۆڤن.گووتی:منیش لە پێشدا وام دەزانی کە مرۆڤم،بەلأم بە درێژایی تەمەنم نەمتوانی تەنها جارێکیش ئەوە بسەلمێنم..!بۆ نمونە ئەگەر ئێستا من و تۆ هاوار بکەین کەس گوێی لە دەنگمان نابێ،لەبەرئەوەی مردووین...بەلأم ئێستا بە سەدان هەزار مرۆڤ هەن لە ژیان دان و زیندوون،لەبەر هەژاری و نەداری هاوار هاواریانە،بەلأم بە داخەوە کە کەس گوێیان لێ ناگرێ وەکو مرۆڤیش نەبن وایە...تۆ ئەوانە بە مرۆڤ دەزانی کە تەنها ڕۆژی سەرژمێری گشتی و باج وەرگرتن و هەڵبژاردن یان بۆ خزمەتی سەربازی ناویان دەخەنە لیستەکانەوە؟ڕووی تێکردم و گووتی:ئێستا تۆ خۆت بە مرۆڤ دەزانی؟دڵنیام نەخێر..!لەبەرئەوەی مرۆڤ دەبێ وەکو مرۆڤ بژی،بۆیە تا

له ژیان دابوو نەمتوانی خۆم ڕازی بکەم کە مرۆڤم.بەڵام ئێستا کە مردووم دەرفەتێکی چاکم بۆ ڕەخساوە کە بیرێکی زۆر قوڵی لێ بکەمەوە،تا بزانم کە کاتێ لە ژیاندا بووم مرۆڤ بووم یان نا؟

مێشە کەرانەی خۆشەویست:

زۆرم بەزەیی پێدا هاتەوە،لێم پرسی:باشە لێرە دوای ئەو هەموو بیر کردنەوەیە دڵنیا بووی کە لە ژیاندا مرۆڤ بووی یان نا؟گووتی:تا ئێستا بۆم ساغ نەبۆتەوە،بەڵام ئەگەر مرۆڤ بام لە کاتی هەڵبژاردن دا دەنگی منیان نەدەکڕی و دواییش ئەو هەموو باجەیان لێ نەدەستاندم...

مێشە کەرانەی ئازیز:منیش هاتمە سەر ڕای ئەو مردووە،بە ڕاستی ئێمەش لە کۆمەڵەی ئەوین،وەك ئەویش دەنگمان نەبیسترا،گۆرانییەکانیشمان تەنها بۆ دەروونی خۆمانن...ڕەنگە بەڕێزیشت کە ئەم نامەیەت بە دەست گەیشت دەست بکەی بە بیرکردنەوە،هیوام وایە تۆش شانۆ گەرییەکانت لێ تێك نەچێ،نەکەی بۆ شانۆگەری خەماوی پێ بکەنی و بۆ کۆمیدیش بگریەی.خوایە لە پێوەدانی مێشە کەرانە بمانپارێزی...

هیوای کامەرانیت بۆ دەخوازم...

((کەری تۆپیو))

((نامەی چواردەهەم))

((گۆرانی تەرمی لاوێک لەگەڵ تەرمی پیرێژنەکە))

خۆشەویستی دڵ و گیان:

مێشە کەرانە خۆت باش دەزانی ئەگەر کارێکت لە یەکێك لە دام و دەزگایەکانی دەوڵەت گیری خوارد،بە چەند مانگ ڕزگارت نابێ،ئێمەش ڕاست وەك کاری فەرمانگەکانمان لێ هاتووە.ڕۆژێك سەر لە بەیانی دەرگای ژێر زەمینەکە کرایەوە،دوو کارگوزارو لادێیەك خۆیان بە ژووردا کرد.لادێییەك هاواری کرد:ئەی داد و بێ داد کوا تەرمی کوڕەکەم؟یەکێك لە کارگوزارەکان گووتی:خاڵە هاوار مەکە خۆ کوڕەکەتمان نەخواردووە...!ئەگەر لێرە نەبێ دیارە هەواڵەکەیان بە هەڵە پێداوی،ڕەنگە کوڕەکەت لە یەکێك لە هۆڵەکانی سەرەوە بێت،لادێییەکە بە گریانەوە دەیگووت:دەك کوێر بم،ڕۆڵە گیان بە دەستی خۆم هێنامی ئێستا دەڵێن لێرە نییە.ئەی هاوار شێت بووم.کاکەگیان:بۆ پێت وایە لە نەستەمبوڵ بەم هەموو گەورەییە تەنها ئێرە خەستەخانەیە؟مەگری کاکە مەگری لێرە بێجگە لەبەرگە سەرین و سەر چەف و ماڵی فەرانبەران هیچ شتێکی کە بزر نابێ،لادێییەکە گووتی:کوڕینە تووڕە بوونی ناوێ ئەوەتا کارتم وەرگرتووە ژمارەی دۆڵابەکەشی لەسەرە.یەکێك لە کارگوزارەکان کارتەکەی لێ وەرگرت،سێ چوار جار سەرە و بنی

کرد،لەبەردەمی چەکمەجێك وەستا.خاڵە ئەوە کوڕەکەی تۆیە"نەخێر ئەوە کوڕی من نییە..!کارگوزارەکە تووڕە بوو.گوایە ئێمە درۆت لەگەڵ دەکەین"نەوە نییە هەمان ژمارەی کارتەکەی تۆیە؟کابرا زیاتر نزیك بۆوە،جوانتر سەیری تەرمەکەی کرد و گووتی:بەخوا ئەوە کوڕی من نییە!بابە ئەوە بە هیچ جۆرێك لە کوڕی من ناچێ..کاکە گوێت لێ بێ:کوڕەکەی تۆ دوو هەفتە زیاترە لێرەیە،لێرە مردوو گۆڕانیان بەسەردا دێ زۆر کەس مردووی خۆیان ناناسنەوە.کابار ڕووی گرژی خۆی کردە کارگوزارەکان و گووتی:بابە خۆ ئێوە چاو و عەقڵتان هەیە ئەو تەرمە تەرمی ئافرەتە و ئافرەتێکی بە ساڵدا چوو،تێگەشتی یان نا؟کارگوزارەکە گووتی:زۆری لەسەر مەڕۆ ئەوە مەیتی کوڕەکەی تۆیە..!تۆ لە لادێوە هاتووی ئاگات لە دنیا نییە،ئێستا لێرە بە هۆی پێشکەوتنی زانست و ئامێرەکان ژن دەکەن بە پیاو!لاو دەکەن بە پیرێژن!کابار دەستی کرد بە لە خۆدان:ئای کوێر بم ڕۆڵەی شیرینی خۆم نەناسییەوە...تەرمی پیرێژنەکەیان خستە سەر((دەستە بەرە)) و بردیانە دەرێ،کابراش بە دوایاندا...

لاوێك لە مردووەکان گووتی:خۆزگە منیش لادێییەکم لێ پەیدا دەبوو،قیر و سیا دەیکردم بە دایکی،بە خەسوی،بەس لێرە ڕزگاری کردبام...

مێشە کەرانە گیان:دوای ئەوە بە دوو ڕۆژ کوڕی کابرای لادێییان برد بۆ هەڵدڕین،دکتۆرەکان هەرچی کردیان هۆکاری مردنەکەیان نەزانی بەڵام لە ڕاپۆرتەکەیان نوسیبوویان:پێمان سەیرە ئەو لاوە بەو هەموو چەرمەسەرییەی ژیان چۆن گەیشتۆتە تەمەنی بیست ساڵی.

برای خۆشەویستم مێشە کەرانە:لێرە ڕاپۆرت وەك لای ئێوە نانوسن...!
((ڕۆیی و هەرگیز جێی پڕ نابێتەوە))بەڵکو دەنوسن:بە هۆی میکرۆب و ڤایرۆسەوە گیانی لە دەست داوە...یان بە هۆی لە کار کەوتنی یەکێك لە ئەندامەکانی لەشییەوە،مێشەکەرانەی هاوڕێی دڵسۆزم،ئەگەر مردنی من بە شێوەیەکی یاسایی ڕاگەیەندرا تابلۆیەکم بۆ هەڵواسە و لەسەری بنوسە:هاوڕێی کۆچ کردووم،شاعیری مردووی بێ مێشك مردووە پێی وایە زیندووە،کۆچی دوایی کردووە...

هەر بژی بە شادی...

مێشە کەرانەی هاوڕێم....کەری تۆپیو

((نامەی پانزەهەم))

ئازیزەکەم مێشە کەرانە لە دواییدا ئەو ئاواتەم هاتە دی و ڕۆژێك بردیانم بۆ پزیشکی یاسایی،ئەو شوێنە وەك قەساب خانە و شوێنی سەربڕینی مریشك وایە.لە پێشدا مردووەکە دەبەن بۆ هۆڵێك کە لە سەر شێوەی ((فریزەر))دا دروست کراوە،بۆ ئەوەی مردووەکان هەتا نۆبەی هەڵدڕین و پارچە پارچە کردنیان دێت لەو ((فریزەرە))دا بیهێڵنەوە و بۆگەن نەکەن...هەر کە لە نێوان مردووەکاندا درێژیان کردم پێنج شەش کەس خۆیان بە ژووریدا کرد لە ئەنجامی گفت و گۆ و قسەکانیان زانیم کە ئەوانە پزیشکی یاسایی و کارگوزاری ئەو شوێنەن،چەند بڕیارێکیان دا و چوونە دەرێ.لام وابێ سێ شەو و سێ ڕۆژم لەو شوێنەدا ڕابوارد.لەوێ زوو زوو ئەو جۆرە میوانانەمان دەهات کە بە دوای یەکێك لە ئەندامی بنەماڵەکەیان یان خزمێکیاندا دەگەڕان...
بە تایبەتی ئەوانەی کە کەس و کاریان ون بوبون...ئەو میوانانە زۆر بە دیقەت سەیری مردووەکان دەکەن!هەر کاتێك یەکێك کەسێکی خۆی ناسییەوە خێرا ڕاپۆرتێکی بۆ پڕ دەکەنەوە و مردووەکەیان دەدەنەوە.ئەوەندەی نەمابوو تەرمەکەی من بدەنە پیاوێك کە ماوەی چوار مانگ بوو ژنەکەی لە دەستی هەڵهاتبوو.دوو منداڵیشی بەسەردا

بەجێهێشتبوو ...بەلاّم باش بوو لە لیستەکەدا بەرامبەر ناوی من لە خانەی ڕەگەز نوسرابوو((نێر))،دەوام ئەوەندەی نەمابوو تەواو بێ کە لاوێك خۆی بە هۆڵەکەدا کرد،هەوڵی ئەوەی بوو کە تەرمی برزایەکەی بدۆزێتەوە بەستە زمانە لە شارێکی زۆر دوورەوە هاتبوو،دوای گەڕانێکی زۆر کە نەیتوانی مەیتی برازا نازدارەکەی بناسێتەوە بە نائومێدی بەرەو دەرگای هۆڵەکە ڕۆشت،بەلاّم کاتێ نەیتوانی دەرگاکە بکاتەوە.دەستی کرد بە لێدانی دەرگا و بە هەموو هێزی خۆی هاواری دەرکد:تکایە لە ژوورەوە بەجێ ماوم...!بەلاّم کەڵکی نەبوو،...کە زانی هیچ چارێکی نییە هەستی لە خۆی بڕیبە ڕاستی لاوێکی ئازا و بە جەرگ بوو...لە ناو ئەو هەموو مردوانە،پلەی گەرمی هۆڵەکەش پانزە پلە لە ژێر سفرەوەیە.تا بەیانی یان دەمرێ،یان شێت دەبێ!

دەستی کرد بە جگەرە کێشان تۆزێ ڕاما و بیریکردەوە،سیمی ناو پاکەتە جگەرەکەی دەرهێنا وەك و کلیل کردی بە شوێنێکی ناو دەرگای سارد کەرەکە و یەك ڕاست کوژایەوە،ئاوا خۆی لە مردن ڕزگار کرد...بەیانی کاتێك یەکێك لە پاسەوانەکان دەرگای هۆڵەکەی کردەوە دیتی کەسێکی زیندوو لەبەردەمی وەستاوە،هەتا هێزی تێدا بوو هاواری کرد و دەرپەڕی،لاوەکەش بە دوایدا ڕایکرد:کوڕە ڕامەکە،مەترسە من زیندووم،کوڕە وەرە من دوێنێ شەو بەهەڵەی تۆ لە ناو مردوواندا ڕۆژم کردۆتەوە،کاکە وەرە دەرگای هۆڵەکە داخەوە،ئێمەی مردووش مردین ئەوەندە پێیان پێبکەنین...

بەڵێ مێشە کەرانەی بەڕێز:

لەو خەستەخانەیە زۆر بە خۆشی ڕامان دەبوارد.بەڵام بە داخەوە لێرە جێت خاڵییە،خۆزگە لێرەش لەگەڵم دەبووی تا پێکەوە کاتێکی خۆشمان لەگەڵ ئەو مردووانە بەسەر دەبرد...

بە ڕاستی ئەو سێ ڕۆژە تامم لە مردن کرد...خۆزگە لەوێش بەسەرهاتی یەك بە یەکی مردووەکانم دەزانی....

پەیمان بێ لەمەو لاش هەر ڕووداوێکی ئاوا خۆشم بینی لە نامەی دواییمدا بۆت بنوسم ئەی مێشە کەرانەی خوێن مژ

سلاو و خۆشەویستیم بۆ بەڕێزت

برای مردووت

((کەری تۆپیو))

((نامەی شانزەهەم))

((جولەکەیەک لە تەمەنی هەشتا و چوار ساڵیدا مناڵی بوو))

مێشە کەرانەی خۆشەویست:
ئێرەییم پێ مەبە کە مردووم باوەڕت بێ مردنیش بەشی خۆی کێشەی هەیە،زیندووەکان کێشەکانیان بە هەرا و هۆریا و قیژە قیژ چارەسەر دەکەن،بەلاّم مردووەکان بە بێ دەنگی.بە ڕۆژ زۆر نیگەرانین لەبەر ژاوە ژاو و جوڵەی مرۆڤەکان.بەلاّم کاتێ شەو دادێ و بێدەنگی باڵی بەسەر شاردا دەکێشێ،ئارام دەبینەوە و دەحەسێینەوە،بۆیە پێمان خۆشە کە هەمیشە هەر شەو بێ...
مردووەکان هەموو شەوێ تا بەیانی لەگەڵ یەکتری گفت و گۆیانە.بەسەرهاتی تاڵ و شیرینی خۆیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە،پیرێژنێکی زۆر بە تەمەن کە لەبەر پیری دەمارەکانی سەر دەستی و لا ملی هەموو شین ببونەوە،دەتگوت ڕەنگی زێ و ڕووبارەکانن لەسەر نەخشەی وولاّتەکان کێشراون...بۆ تەنها جارێك بەشداری ئێمە ینەکرد.تەنانەت من چەند جارێك لە بارەی مردنییەوە پرسیارم لێ کرد،بەلاّم ئەو بە هیچ جۆرێك وەلاّمی منی نەدایەوە.دەتگووت تەنها ئەو بە ڕاستی مردووە.ئێوارەیەکی ڕۆژی

شەممە مردوریەکی تازەیان هێنا بۆ هۆڵەکە پیرێژن ئەو مردووەی ناسییەوە،خێرا لێی نزیك بۆوە و لێی پرسیئای((ئەفراییم))ئەوە تۆشیان هێنا بۆ ئێرە؟ئەفرایم پیاوێکی جولەکە بوو کە لەسەرتاسەری ولآت کەس لەو دەوڵەمەندتر نەبوو،خێرا لە پیرێژن نزیك بۆوە و ناسییەوە زانی ئەوە هاوسەری پیاوێکی دراوسێی بوو کە بیست ساڵ پێش ئێستا کۆچی دوایی کردبوو،بە حاڵ بیری مابوو...

ئای مێشە کەرانە:وەك دەڵێن سامانی پیاوی دەوڵەمەند چەنەی هەژار شل دەکات.بۆیە کەوتمە چەنە بازی:باشە ئەگەر ئەو پیرێژنە دراوسێی ئەو پیاوە دەوڵەمەندە بووە،دیارە ئەویش خاوەن سامان بووە؟ئەی بۆ تا ئێستا لێرە کەوتۆتەوە.پیرێژنەکە گووتی:رۆڵە گیان ئەوەندە لە شت هەڵ مەبەرێ،ئەو ئەفراییمە لە گەورەترین ڤێلا لە ناو باغێکی زۆر جوان و فراوان بە تاقی تەنیا دەژیا،تەنانەت کارەکەریشی نەبوو.ئەفراییم خزمی زۆری هەبوون،مانگی دوو سێ جار دەهاتنە سەردانی،لە ماڵەکەی شەو بوو لە نێوان کچی خزمەکانی لەسەر ئەوەی کێ جلەکانی بۆ بشوا ،کێ جلەکانی بۆ ئوتو بکات،هێندێ ماڵیان پاك دەکردەوە،ژنەکانیش خواردنیان ئامادە دەکرد.هەموو بیریان لەوە دەکردەوە کە ((ئەفرایم)) مرد باشترین میرات بۆ دڵسۆزترین خزم دادەنێ...بۆیە هەموو خزمەکانی چاوەڕێی مردنی ئەفرایم بوون...بەڵێ هەموویان چاوەڕێ ئەو رۆژە خۆشە بوون.دوای چەند رۆژێك لە مردنی ((ئەفرایم)) مردوویکیان هێنا کە بە رووداوی ئۆتۆمبێل گیانی لە دەست دابوو.

پیریژن و ئەفرایمی زۆر باش دەناسی.دوای چاك و چۆنییەکی گەرم ئەفرایم داوای لێ کرد کە بەسەرهاتی دوای مردنی خۆی بۆ بگێڕێتەوە،بۆ ئەوەی بزانێ کامە لە خزمەکانی دڵسۆزی بووە و کامە لەوان بە دڵ بۆی گریاوە،کابراش دەستی پێ کرد:گەورەم دیارە کە بەڕێزتان خزم و کەسێکی زۆرت هەبوون و هەمیشە سەریان لێ داوی،ئای کاك ئەفرایم وەك دەڵێن:کێو بە کێو ناگات،بەڵام ئادەمی بە ئادەمی هەر دەگات...گەورەم منیش دوای سێ ڕۆژ لە مردنی تۆ مردم،ئەوەتا لەم شوێنە بێ نازە بە یەك گەیشتین...ئەو بەیانییەی کە بەڕێزت کۆچی دواییت کرد.یەکێك لە خزمەکانت هات بۆ سەردانت.دوای لە دەرگادان و زەنگ لێدانێکی زۆر کردی بە گریان و لەخۆدان،ئەوەندەی نەبرد هێندەی دانیشتوانی شارێك خزم و کەسی تۆ لەبەر ماڵەکەت کۆ بوونەوە و وەك ڕۆژی حەشری لێ هات.منیش هەڵمدایە:جا هۆی چی بوو ئەو هەموو خەلکە لەوێ کۆبوونەوە؟مردووە تازەکە کە بە مەراییەوە گووتی:دیارە تۆ مستەر ((ئەفرایم))ناناسی کە چەند پیاوێکی دڵ گەورە و بەخشندە بوو،چەندین ڕەوشتی بەرزی مرۆڤایەتی تری تێدا بوون.ئەفرایم گووتی:ئەی دوایی؟گەورەم دوایی پۆلیس ئاگادار کرایەوە لەگەڵ پزیشکی دادوەری هاتن و دەرگای ماڵی ئێوەیان شکاند.لە نێوان خزمەکانت بوو بە مشت و مڕ،یەکێك دەیگووت خۆی کوشتووە،یەکێك دەیگووت دەك کوێر بم دەرمان داو کراوە،دووان دەیانگووت کوژراوە دوایی بۆ ئەوەی پۆلیسەکان توشی لێپرسینەوە نەبن تۆیان ڕەوانەی پزیشکی دادوەری کرد.

مێشە کەرانەی ئازیز: بۆ ئەوەی بزانیت کە مرۆڤی چاك و بەخشندە لە قیامەتیش سەرفرازە،هەر خێرا دەستەبەك پزیشك و کارگوزار هاتن،ئەفرایمیان برد بۆ هەڵدڕین،دوای دوو کاتژمێر هێنایانەوە.من زۆر زوو تێبینی ئەوەم کرد کە ورگی زۆر ئاوسا بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو کە خەڵکێکی زۆر ڕژانە ناو هۆڵەکە و تەرمی ئەفرایمیان برد بۆ کەنیسە بۆ جێ بە جێ کردنی ڕێو ڕەسمی بە خاك سپاردنی.دیار بوو کە پزیشکەکان هۆی مردنەکەیان دیاری کردبوو.

مێشە کەرانەی خۆشەویست:چاك گوێ بگرە،دیار بوو لە کەنیسە ڕووداوێکی زۆر سەیر ڕووی دابوو کە پێشتر ڕووداوی لەو جۆرە نەدیتراوە نەکەسیش بیستویەتی...بەلاّم ئێمەی مردوو چۆن درێژەی ئەو بەسەرهاتە بزانین؟خوا و ڕاستان دوای ماوەیەك تەرمی ئەفرایمیان هێنایەوە بۆ هۆڵەکە.ئێمە نەماندەتوانیبیبینین کە لە دەم و چاوی ئەفرایم هیچ شوێنێکی ئەفرایم ببینین،چونکە بە پارچەیەکی ڕەشی گەورە هەموو گیانی داپۆشرا بوو.دوای ئەوەی کە لە نێوان خزمەکانیبوو بە هەرا و هریا،ئەفرایم هاواری کرد:وەك فەرمانی سەربازی پێ دابن هەموو بێدەنگ بوون...گوێتان لێ بێ با من نهێنی ئەو کارەتان پێ بڵێم:کاتێك منیان بردە هۆڵی هەڵدڕین لەسەر مێزێك درێژیان کردم،بە دوو سێ پزیشك دەستیان کرد بە هەڵدڕینی ورگم،لەو کاتەدا ئافرەتێکی مردوویان هێنا،لە تەنیشت من دایان نا،دکتۆرەکان دەستیان کرد بە هەڵدڕینی ورگی ئەویش کە دوو منداڵی مردوو لە سکی دابوون کە یەکەم منداڵیان دەرهێنا خستیانە سەر ورگی من،لەبەرئەوەی منیش ورگم هەڵدڕا بوو منداڵەکە کەوتە ناو سکمەوە و دووریانەوە بە بێ

ئەوەی دکتۆرەکان بەو کارە بزانن.دوایی ورکی ئافرەتەکەیان دووریەوە یەکێك لە دکتۆرەکان تووڕە بوو من بە دەستی خوم دوو مندالم لە سکی ژنە مردووەکە دەرهێنا چۆن هەر یەك منالێ ماوە...

بەڵێ مێشە کەرانە:کاتێك مستەر ئەفرایم ئەو بەسەرهاتەی بۆ خزمەکانی دەگێڕایەوە هەموو بە بێدەنگی بەرامبەری وەستابوون.دەتگووت هەناسەیان لەبەردا نەماوە...دووبارە دەستی پێ کردەوە:کاتێك خاقانەکە لە کەنیسە ناوی بە دەم و چاوەمدا دەکرد و پاکی دەکردەوە،دەستی کەوتە سەر سکم و هەموو تەقەڵەکان هەڵ وەشانەوە و منداڵەکە لە سکم هاتە دەرێ.

یەکێك لە خزمەکانی گووتی:کوێر بم بۆت ئەگەر منداڵەکەش مابا بۆ ئێمە هەر باش بوو.خزمێکی کەی کە پێش من ڕاوەستا بوو ڕووی تێکرد،بە تووڕەییەوە پێی گووت:سەگی سەگباب وس بە با نەکێشم بە دەمتا ئەگەر ئەو هەتیوە نەمردبا بۆ کەسمان لە میراتی ئەفرایم سەلکە پیازێکمان پێ دەبرا...

مێشە کەرانەی هاوڕێم:

چاوت لێیە لێرە شتی چۆن ڕوو دەدات،هەر چەند لە ناو زیندووەکاندا شتی سەیر دەبینین بەڵام لە ناو مردووەکاندا شتی سەیرتر...

هەرچەندە ژیان بەڵێ ژیان لە خەیاڵ خێراترە بەڵام هەتا ئێستا نازانم مردن لەسسەر خۆیی و خێراییەکەی چۆنە...

هەربژی بە خۆشی مێششە کەرانەی بەختەوەر

برات

کەری تۆپیو....

## ((نامەی حەڤدەهەم))

مێشە کەرانەی ڕەزا سوک:لێرە هیچ کەس بایەخ بە من نادا،هەر وەك لە بیریان چوبێتمەوە وایە...چۆن تا لە ژیانیشدا بووم کەس منی لە بیر نەبوو.خۆ لێرە کەس دەنگی مردوو نابیستێ...هەزار جار هاوار کە:ئەوەتام لێرەم،بۆ خاتری خوا ئاوڕێکم لێ بدەنەوە،کەس نییە وەڵامت بداتەوە...هەرچەندە من تا ئێستاش لە مردن بێزار نیم چونە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ڕۆژگارەکانی ژیانمدا...بەڵێ چاوەکەم با بمری،دەزانی ئێمە زۆر پێش ئەوەی بمرین مردووین...یان پێش ئەوەی بمانەوێ بمرین لە ناوەختدا دەمرین.ئەوەتا پێش تاوێك تەرمی کوڕێکیان هێناوە ناوی ((شەوکەت)) ە بە دەم هەنسك و گریانەوە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە،ئەگەر دڵت بەرد بێ بۆی دەبێ بە ئاو...یەکێك لە مردووەکان بە چاوی پڕ گریانەوە لێی پرسی:کاکە بە چی مردووی؟بە دەم نوزە و ناڵەوە هاواری کرد:تۆڵە بەڵێ تۆڵە جەرگی بنەماڵەکەمی بڕی...چەند ڕۆژێك پێش ئێستا بەشەرهاتێکم بەسەرهات کە هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات...بۆ تۆ کەسێکت کوشتبوو؟نەخێر...چەند ساڵێك پێش ئێستا کوڕە مامێکم لەگەڵ کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندی بە دەستەڵات بوون بە هاوڕێی گیانی بە گیانی

یەکتری هەرچەند باوکم و مامەکانم هاواریان کرد:ڕۆڵە ئەوانە کەسانێکی دەوڵەمەند و بەمێزن.ئێمە خەڵکی کاسب و فەقیری ماڵی خۆمانین.ئێمە و ئەوانیان نەگووتووە...بەڵام ئەو کوڕەی ئامۆزام قسەی باوکم و مامەکانمی بە گوێدا نەچوو،لە کۆتاییدا بە هەردووکیان حەزیان لە کچێك کرد.ئامۆزایەکەم بە دزییەوە کوڕی کابرای دەوڵەمەندی کوشتبوو.. کە ڕووداوەکە ئاشکرا بوو،باوکم زۆری هەوڵدا کە مەسڵەحەت بکات بەڵام ئەوان بە هیچ شتێك ڕازی نەبوون...هەر دەیان گووت خوێن ڕشتن بە خوێن ڕشتن چارەسەر دەکرێت ..نیوە شەوێك دایان بەسەر ماڵی مامدا خۆی و کوڕەکەیان کوشت...بەوەش وازیان نەهێنا،بڕیاری بنە بڕ کردنی بنەماڵەی ئێمەیاندا.وردە وردە لێیان دەکوشتین تا باوکم و دوومامی کەم و چوار ئامۆزای کەیان کوشتم...ڕۆژێك کەمینێکیان بۆ من دانا گولەیەك بەر قۆڵم کەوت،خوا پاراستمی ونەمردم.ناچار دایکم بە دزیەوە ناردمی بۆ ماڵی خاڵەکانم بۆ گوندێکی یەکجار دوور.کە ناوی سەربازیم هاتەوە هەر لەماڵی خاڵەکانمەوە چووم بۆ خزمەتی سەربازی،ئەو کاتەی سەربازیم تەواو کرد.دایکم هات بۆ لام بڕێ پارەی بۆ هێنابووم گووتی:ڕۆڵە بۆ خۆت بڕۆ بۆ ئەستەمبوڵ.ناوی خۆت بگۆڕە و دەست بکە بە کار و کاسبی و ژنێك بێنە،دوایی منیش دێم بۆ لاتان و هەر خزمەتی خۆت و ماڵ و منداڵت دەکەم.بۆ ئەوەی ئەو دوژمنانە نەت ناسنەوە و زەفەرت پێ نەبەن،ڕۆڵە کزەی جەرگم.هیچ ڕێگە چارەیەکی کەمان نییە.لەسەر داوای دایکم خۆم پێچایەوە،ئەستەمبوڵ بگرە هاتم...لە دێ لەگەڵ خاوەنی میوان خانەیەك ڕێك کەوتم کە شەو تا بەیانی ئیش و کاری میوان خانە ڕاپەڕێنم بەو

مەرجەی من کرێ نەدەم و ئەویش مانگانە نەدا بە من بەو شێوەیە شوێنی نوستنم دابین کرد.بە ڕۆژیش کرێکاریم دەکردلە ژورێك لەگەڵ مەسعود ناوێك دەخەوتم کریی چوار مانگی خاوەنی ئوتێلەکە قەرزار بوو.شەوێك هاتمەوە هەواڵی مردنی مەسعودیان دامێ زۆرم پێ ناخۆش بوو،کابرا گەردەنی مەسعودی ئازا کرد بەلاَم دەیویست ناسنامەکەی بفرۆشێت لە بری قەرزەکانی.ئەوە بۆ من هەلێك بوو هەڵکەوت،ناسنامەی مەسعودم لێ کڕی ناسنامەکەی خۆم و هێندێك پارەم دا پێی.ئیتر لەمەولا من ((شەوکەت حسێن)) نیم بگرە ((مەسعود کەریم ئۆغلو))م....لەمەولا باوکی دوژمنەکانیشم من ناناسنەوە.ئوتێلەکەم بەجێ هێشت،بڕیارمداهەرگز بە لای ئەو ئوتێلەدا نەچمەوە.ئای ئەو نەگبەتەی کە ناسنامەی من دەکرێت ئەگەر ڕۆژێك بکەوێتە دەست دوژمنەکانم دەم و دەست لەت و پەتی دەکەن...بە هەر حاڵ ئێستا من کەسێکی تازەم ناوم ((مەسعود))ەشەوکەت حسێن هەر ناناسم.لەبەرئەوەی شوێنی نوستنم لە کیس چوو،وردەوردە پارەکانم ڕوویان لە کزی دەکرد،ناچار دەستێك نوێنم کڕی شەوانە لە باغی گشتی دەخەوتم.بە ڕۆژیش هەر لە نزیك جێی نوستنەکەم بۆیاغچی بووم.ڕۆژێك پێلاَوم بۆ کابرایەك بۆیاغ دەکرد.ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوە بوو،سەرم هەڵبڕی لە لاپەڕەی دواوە نوسرابوو...دوێنێ شەو هاولاَتییەك بە ناوی ((شەوکەت حسێن)) خەڵکی گوندی ئەسکەلیب کوژراوە تا ئێستاش پۆلیس خەریکی لێکۆڵینەوەیە.لەو کاتەدا زۆر دڵشاد بووم و زۆریش غەمبار بووم.جا چۆن مرۆڤ لە یەك کاتدا دڵشاد و غەمبار دەبێ؟بەڵێ من وابووم.دڵشاد بووم لەبەرئەوەی ڕزگارم بوو لە

دوژمنەکانم،غەمبار بووم لەبەرئەوەی هەواڵی مردنی خۆم لە ڕۆژنامەدا خوێندەوە.نازانم چەند شەو بوو لە باغی گشتیدا دەخەوتم...بەیانییەك زوو لەسەر سەندەڵییەکی باغەکە ڕاکشا بووم،ئەوەندەم زانی بە سەدان خەڵك لە هەر چوار لاوە ڕژانە ناو گۆڕەپانی بەردەمی باغەکە،بوو بە هەرا و تێك هەڵدانێك هەر مەپرسە.بە شەش حەوت کەس هێرشیان دەکردە سەر یەك دووانێك تا بێهۆشیان دەکردن تێیان هەڵدەدان.سێ چوارێك پەلاماری منیان دا هاواریان کرد:باڵی ڕاستی یان چەپ؟منیش گووتم:خەڵکی میراوام، گوتیان:کەرباب کەس پێی گووتوی خەڵکی کوێی...؟خێرا پێمان بڵێ باڵی ڕاستی یان چەپ؟منیش لەبەرئەوەی ناسنامەی کەسێکی کەم پێیە لە ترسا گووتم:نازانم...!پەلاماریان دام و لێدانێکیان لێ دام کافر لە ماڵت نا ئومێد بێ.وایان لێ کردم خۆم بە پێوە نەدەگرت.وەك تایەی ژێر عەرەبانە کە ولاّغ ڕایکێشێ تل دەبوومەوە و ئەملا و ئەولام دەکرد.هاواریان دەکرد:دوو ماکەری وەك تۆ ولاّتی ئێمەیان وێران کردووە هێندەی بارگیرێك دەبێ، دەڵێ نازانم باڵی ڕاست و چەپ چییە...کە بە جێیانهێشتم،ئەوەندەی کە وێران بووم،بەوەی کە ئەو خەڵکەکە بەسەرمندا ڕایان دەکرد نەمدەتوانی هەستمەوە و ڕاکەم...هێشتا بە تەواوی هەڵنەستابوومەوە کە کۆمەڵێکی کە گەیشتنە سەرم.خێرا بیڵێ ڕاستی یان چەپ؟لە دڵی خۆمدا گووتم با یەکێکیان بڵێم،گووتم:لە سایەی خواوە باڵی ڕاستم.لە قسەکەم نەبوومەوە کە لە دواوە شەقێکی وایان تێ هەڵدام.وەك گلۆڵە لە دەستی پیرێژن بکەوێتە خواری تل بوومەوە و چوار مەتر ئەولاتر خۆم گرتەوە...بەر چاوم تاریك بوو،کە چاوم هەڵهێنایەوە یەکێك بە تێلاوە لە

سەر سەرم وەستابوو.گووتی:گوێدرێژ ڕاستی یان چەپ؟وامزانی هەر ئەوانەی پێشوون گووتم:لە خوا بە زیاد بێ چەپم.تێلاّی هەڵبڕی کە لێم دا،باش بوو یەکێکیان گووتی:وازی لێ بێنن پێ دەچێ شەقی چاکی خواردبێ،خۆتانی پێوە هیلاك مەکەن.تۆزێکی کە بۆ خۆی دەمرێ. هەر ئەوانە پەلاماری دوانی کەیان دا،خێرا چەپ یان ڕاست هێشتا وەلاّم لە دەمیان نەهاتبۆ دەرێ کە دەم و لوتیان پڕ کردن لە خوێن.بە ڕاستی سەیرە...!مرۆڤ لە کاتی تەنگانەدا هێزێکی بەرگری گەورەی لەلا دروست دەبێ کە بەرگەی شتی لە ئاسن و پۆلاّش ڕەقتر دەگرێ...ئەوانەی بە لای مندا دەهاتن،وایان دەزانی کە مردووم بۆیە وازیان لە من هێنا...یەکێك بە لای مندا ڕایکرد بانگیان کرد ئەڕۆی کوڕە وەرە...چەپی یان ڕاست؟شوکور بۆ خوا چەپم...زۆر باشە لە خۆمانە کوتایان ئەمما کوتایان...هەتا نیوەڕۆ هەر خەڵك بوو یەکتریان دەگرت،وەرە ڕاستی یان چەپ؟من بە چاوی خۆم نەمدی هیچ کەس لە تێلاّ و شەق ڕزگاری بێ دەیگوت چەپم تنیان هەڵدەدا دەیگووت ڕاستم هەر دەیخوارد،خوێنێکی زۆرم لەبەر ڕۆیی بووبەرچاوم تاریك بوو،ئاگام لە خۆم نەما..کە چاوم کردەوە لە ئۆتۆمبێلی پۆلیس دابووم،تەنانەت زمانیشم نەدەگەڕا.نەك هەر من بە دەیان برینداریان هێنابوو بۆ خەستەخانە،لە ژێر چاودێری پۆلیس ڕەوانەی قاوشی خەستەخانە کراین،چەند کەسێك هاتنە سەر سەرم،یەکێکیان گووتی:ئەوەش بەڕن مردووە،توانای جوڵە و قسە کردنم نەمابوو تا پێیان بڵێم:بۆ خاتری خوا مەمبەن،نەمردووم...ئەفسەرێك هاواری کرد:خێرا ناوی مردووەکان.جا ناوی مردووەکان بۆچی تۆمارکەین؟تا توشی

لێپرسینەوە نەبێ...لە دڵی خۆمدا گووتم:ئەمڕۆ بە بەرچاوی دەوڵەتەوە بە دەیان کەسی زیندووی بێ تاوانیان کوشت هیچ لە گۆڕێ نەبوو،دیارە لێرە لەسەر مردووەکان زیاتر لە خەڵك دەپرسنەوە...دکتۆرێك هاتە سەر سەرم:بانگی کرد:ئەوەیان ماوە،ئاهێك لە دڵم گەڕا،پاسەوانەکە گووتی:وەرن بیبەن بۆ مەیتخانە،دوای تۆزێکی کە لەوێ گیانی دەردەچێ!کەی ئەو مانە ئەو کورە ماوە؟ناسنامەکەیان لەگیرفانم دەرهێنا،کام ناسنامە؟هی مسعود کریم ئۆغلۆ،تا ناوم لە لیستی مردووەکان تۆمار کەن...لەگەڵ چەند مردوویەکی تر فڕێیاندایە ساردخانەوە.بە هۆی ساردی شوێنەکەوە وردە وردە هاتمەوە سەر حاڵ،هەستامەوە سەر پێ،بۆنێکی یەکجار ناخۆش پەرێشانی کردبووم.بە هەر حاڵێك بوو شوشەی یەکێك لە پەنجەرەکانم شکاند،بەسەر دیواری خەستەخانە وەك بروسکە بۆی دەرچووم دەتگوت ئەوە من نەبووم ئەو هەموو شەق و تێهەڵدانەم خواردووە.چەند کۆڵان ئەولاتر خۆم کرد بە چایخانەیەکدا.هێشتا چایەکەی بەردەمم نەخواردبۆوە کە کۆمەڵێك پۆلیس خۆیان کرد بە ژووری چایخانەکەدا.دەست هەڵبڕن کەس نەجوڵێ...!لاچاوێکم دایە ئەوانەی تەنیشتم،هەموویان وەك گەڵای پاییزی دەم ڕەشەبا دەلەرزین،من هەرچەندە هێزی لە رزینیشم نەبوو ناچار دەستم کرد بە لەرزین،دەستیان کرد بە پشکنینی خەڵکەکە،لە سایەی خواوە من نە دەمانچە و نە خەنجەر و نە چەقۆم پێ نەبوو...تەنانەت دەرزییەکیش...پۆلیسێك پێی گووتم:ها خوێڕی ئەو شوێن برینانە چین بە سەر و چاوتەوە؟پێش ئەوەی دەم بکەمەوە ئەوەی تەنیشتی

گووتی:پێناسنامەکەت خۆ ناکرێ بڵێم لە فلأنە خەستەخانەیە کە لێوەی هەڵهاتوم. گووتم:گەورەم لێم ونبووە،فڕێیان دامە ناو ئۆتۆمبێلی پۆلیسەوە کە پڕ بوو لە خەڵکی سەر و گوێ شکاو.بردیانین بۆ بەڕێوبەرایەتی ئاسایش لەوێ وەك ئاژەڵ لە ژێر زەمینێکیان کردین... تا سێ ڕۆژ لێیان نەپرسینەوە. لەوێ نان و ئاوێکیان دەداینێ، هەر چۆنێك بێ لە مەیتخانە چاکتر بوو. ئەوانەی لەوێ پارەیان پێ بوو حاڵیان باش بوو،خواردن و جگەرە و تەنانەت ڕۆژنامەشیان بۆ دەهات. لەیەکێ لەو ڕۆژنامانە خوێندمەوە نوسرابوو:ئەو تاوانبارەی کە شەوکەت حوسێن ی کوشتووە پێناسەی خۆی بەجێهێشتووە، ئێستا بەپێناسەس کوژراوەکە دەگەڕێ ..!کەواتە دەبێ من خۆم خۆم کوشتبێ.دوای سێ ڕۆژ بانگیان کردم.دوو پۆلیس قۆڵیان گرتم و بۆ سەرەوەیان بردم بردیانمە هۆڵێکی گەورە،چەند کەسێك دانیشتبوون دیار بوو کە ئەوانە دادوەرن،یەکێکیان لێی پرسیم:ناوت چییە؟خۆ ناکرێ ناوی ڕاستەقینەی خۆم بڵێم کە ((شەوکەت حسێن)) ە لە دادگا ناوی بە کوژراو تۆمار کراوە.گووتم ناوم☹(مەسعود کەریمە))خەڵکی کوێی؟گەورەم خەڵکی مەسعودیەم...یەکێك لە دادوەرەکان گووتی:ئەو ((مەسعود کەریمە))یەکێکە لەو کەسانەی کە تاوانبار کراوە بە کوشتنی ((شەوکەت حسێن)) ئەوەش دان پێدانانی خاوەن ئوتێلەکە کە لە لای ئێمە تۆمار کراوە...زۆر ترسام زانیم کە خاوەن ئوتێل و مەسعود کەریم فێڵێکی چۆنیان لە من کردووە!ڕەنگم تێك چوو.زانیم کە بە هیچ جۆرێك لەم داوە ڕزگارم نابێ...بڕیا هەر لە سارد خانە بام و دوای چەند ڕۆژێك بۆ خۆم دەمردم،چارەم لە چارەی پۆلیس و ئەو ژیانە پڕ ئێش و ئازارە

دەبوٚوە.دیسان لێی پرسیمەوە:تۆ لەگەڵ شەوکەت حسێن لە یەك ژووردا بوون؟یان نا؟بەڵێ گەورەم بەیەکەوە بوین...ئەی لەسەر چی کوشتت؟بیڵێ ئەو پیاوەت بۆ کوشت؟هاوارم کرد:من نەم کوشتووە،بەخوا من پیاو کوژ نیم...ئەی ئەگەر نەت کوشتووە بۆچی هەمان شەو نوتێلەکەت بەجێهێشت؟

باشە دەکرێ پیاو خۆی خۆی کوشتبێ و لەبەر دەمی دادگاش وەستابێ؟دادوەر بانگی کرد:خێرا تاوانبارەکانی کەش یەك یەك بانگ کەن.لە پێشدا منداڵێکی تەمەن پانزە ساڵیان بانگ کرد،دیار بوو ئەوەندەیان لێ دابوو بە پێوە خۆی نەدەگرت.قسە بکە کورە،گەورەم منی بانگ کردە ژوورەکەی خۆی کە بڕێ پارەم بە قەرز بداتێ،کە چوومە ژوورەوە داوای لێ کردم جلەکانم داکەنم،لەبەرئەوەی من لەو جۆرە کەسانە نەبووم لە ژوورەکەی هاتمە دەرێ و نوتێلەکەم بەجێهێشت.دووەم تاوانبار کە هێنایان پیاوێکی یەکجار ڕەزا گران بوو،دیار بوو بە لێدان هەلا هەلایان کردبوو:من چووم بۆ ژوورەکەی تا ئەو برە پارەیەی کە لێم قەرز کردبوو پێی بدەمەوە،تەنانەت لە ژوورەکەشی دانەنیشتم کە من هاتمە دەرێ ئەو زیپ و زیندوو بوو...لە دادگا هەموو گرانایییەکیان خستە سەر من،شەو تا بەیانی هەڵواسین و دارکاری،بە ڕۆژیش لێکۆڵینەوە...تا شەوێکیان لە ژێر لێدانێك کە نەمتوانی خۆمی بۆ ڕاگرم،هاوارم کرد:بەڵێ من کوشتم،بەخوا من کوشتم...خێرا پۆلیسێك رایکردە لای چوار تاوانبارەکەی کە و مژدەی پێ دان،کە لە تاوانێکی گەورە ڕزگاریان بوو،تاوانبار مەسعود کەریم دانی بە تاوانەکەیدا نا کە ((شەوکەت حسێن)) ی بێ تاوانی

کوشتووه.یەکێك لە دادوەرەکان گووتی:چاوتان لێیە؟هەموویان یەکەم جار دەڵێن:نازانم،ئاگادار نیم،بەخوا من نەمکوشتووە...کوتەك دەزانیٚ قۆناغ لە کوێیە؟پێیان گووتم:بزانین چ تاوانێکی تری لەو جۆرەت کردووە؟گووتم:گەورەم سەریشم بڕی درۆ ناکەم،لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی بەسەرهاتی خۆم بۆ دادوەرەکان گێڕایەوە...بەڵێ ئەوەی کە ئێوە دەڵێن کوژراوە ئەوە منم من ((شەوکەت حسێن)) م کە لە ترسی تۆڵە،سەرگەردان و وێڵی ئەو شارە گەورە و بیٚ سەر و بەرەیە بووم؟من لەسەر باڵی ڕاست و چەپ توشی ئەو کارەساتە بووم کە ئێستاش نازانم باڵی ڕاست چەپ مانای چییە...چۆن لە مەیتخانە ڕام کرد و گیرام،بە دەم کوڵی گریانەوە بەردەوام بووم لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆم...!سەرۆکی دادگا گووتی:ئەی چۆن دانت بەوەدا نا کە کوشتوتە؟گەورەم:گووتم:باڵی ڕاستم تێیان هەڵدام گووتم:چەپم دارکارییان کرد،هەتا دەمگوت من نەمکوشتووە.زیاتر لێیان دەدام و لە ئاوی ساردیان هەڵدەکێشام.بانگی پۆلیسەکانی کرد،وەرن بیبەنەوە خوارێ،هەر کە دوو پۆلیس هاتن بمبەنەوە بۆ ژێر زەمینەکە،ملم بەسەر شانی یەکێکیان دا لار بۆوە و کۆتایی بە ژیان هات...جارێکی کە هێنایانمەوە بۆ ساردخانە،ئەمجارەیان بە ڕاستی مردم...

مێشە کەرانە:خۆ چاکت گویٚ لە بەسەرهاتی ئەو کورە بەستەزمانە بوو...لە ناو ئەو هەموو مردووانە من بە دەنگ هاتم:واتە تۆ دوژمنەکانت ئەیان کوشتویەوە،ئەی کەوایە بۆ مردیٚ؟ئەو مردووەی تەنیشتم هەڵیدایە:شێتە کەسێك چەند شەو و چەند ڕۆژ لە ئاسایش تێیان هەڵدابیٚ دەبیٚ لێی بپرسی:بۆ مردووی؟

بەڵێ میشە کەرانەی نازدار،دوای دوو ڕۆژ تەرمی کوڕەکەیان برد بۆ هەڵدرین،دایکی کلۆڵیشی هەتا هەتایە چاوەڕێی نامەی کوڕەکەیەتی...

برای مردووت

((کەری تۆپیو))

((نامەی هەژدەیەم))

خۆشەویستی گیانم:مێشە کەرانە بە ڕاستی ئەو نامەی کە لێرە لە مردنم کردوومە هەرگیز لە ڕۆژگارەکانی ژیان نەکردووە،،کە هەر بە ناو زیندوو بووم....تۆش هەر لە ئێستاوە لە هەوڵی ئەوەدا بە کە سەفەری مەرگت هاتە بەر،هەتا دەتوانی لە مەیتخانە بمێنەوە...چونکە لێرە بە تایبەتی شەوانە تا بڵێی ئارام و بێ دەنگە...شەو هەر کە بێدەنگی باڵ بەسەر مەیتخانەدا دەکێشێ،مردووەکان پێیان خۆشە هەتا دەتوانن قسە بکەن،بۆ نموونە دوێنێ شەو گفت و گۆی نێوان مردووەکان وەك کۆنگرەی پارتێکی سیاسی لێ هات.یەکێك بە دەنگێکی گەورە گووتی:تکایە با یەك یەك باسی ئێش و کارەکانمان بکەین.من هەڵمدایە:بەڕێز گیان لێرە کوا ئێش و کار،نابینی هەموومان بێ کارین؟لێم توورە بوو گووتی:گوێ درێژ لێرە نالێم،کاتێك کە زیندوو بوین،بۆ نموونە من پزیشکی پسپۆڕی گوێ و لوت بووم،ئەوەی بۆنێکی کردبێ یان شتێکی بیستبێ زەکاتی نەخۆشی داوە بە من.لە مردوویەکی لاویان پرسی تۆ کارت چی بوو؟من پۆلیس بووم بەڵام داخەکەم بە جوانە مەرگی سەرم نایەوە،باوکم هەموو توانای خۆی خستە گەڕ تا کردمی بە پۆلیس...

مێشه کەرانە:ئەوە باشە لێرەش وەکو لای ئێوە هەموو جۆرە کەسێك هەن...باوەڕت بیٚ بە ووشەی پۆلیس،دار و دەمانچە و فیکە و کەلەپچەم بیر کەوتەوە.بەلاّم لێرە ئەو شتانە بە کار نایەن...پۆلیسەکە لەسەر قسەکانی ڕۆشت،دوای ساڵێکی خزمەتم لە وێستگەی پۆلیسی کە کارم لێی دەکرد نوسراوێکیان دامیٚ بۆ یەکێك لە خەستەخانەکان،تا ئەزمایشی ساڵانەم بۆ ئەنجام بدەن،ئەزمایشی خوێن و میز و پیسایيان بۆ کردم.بەلاّم بە داخەوە بە هۆی دەرکەوتنی ڤایرۆسی نەخۆشییەکی کوشندە لە میزەکەمدا.زۆرم پیٚ سەیر بوو،لاوێکی وەکو من کە بە لای خۆمەوە شێرم بە گویٚ دەگرت...!؟توشی نەخۆشی لەو جۆرە بم.هەموو ڕۆژێك هەشت دەرزییان لیٚ دەدام،زۆربەی خواردنەکانیان لیٚ قەدەغە کردم،ڕۆژ بە ڕۆژ لاواز و لاوازتر دەبووم.شوێن نەمابوو لە لەشی من ئەگەر پارچە گۆشتێ لیٚ نەکەنەوە و نەینێرن بۆ ئازمایش،ماوەی سیٚ مانگ لە خەستەخانە مامەوە.ڕۆژێك پیاوێك هەرایەکی گەورەی لەو خەستەخانەیەدا ساز کرد...تاقی کردنەوەی خوێنی ژنەکەی لەگەلّ هی پیاوێکی پیردا گۆڕا بوو ئەگەر فریای نەکەوتبتا هەر ئەو ڕۆژە نەشتەرگەری وەرەمی مێشکیان بۆ دەکرد،ئەو ژنە بەستەزمانە دوای دە ساڵ هاوسەری تازە نیشانەی دوو گیانی لیٚ دیار کەتبوو...کە باوکم هات بۆ لام بۆم گێڕایەوە...دوای بە دواداچوونی ئەزمایشەکەی من،دەرکەوت کە لەگەلّ هی پیاوێکی نەخۆش گۆڕاوە،باوکم بەپەلە لەسەر خەرجی خۆی منی برد بۆ ئەنقەرە،دکتۆر ئەما ئەمبا بۆ لای،لە ئەنجامی بەکارهێنانی حەب و دەرزە هەڵە پێکهاتەی خوێنم گۆڕا بوو.دکتۆرەکان وایان دانابوو کە من تەنها چەند ڕۆژێکی کە دەژیم...بە

هۆی میلاکی و سەرما و سۆڵە باوکم نەخۆش کەوت هەر زوو تەمەنی درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشت.ئیتر کەس نەما هات و چۆی دکتۆرەکانم پێ بکات،بیرم کردەوە کە من لە ماوەی ئەو نەخۆشییەمدا بە دەیان دکتۆر بوون بە هاورێم،دکتۆرەکان ڕێگایەکی نوێیان بۆ پارە پەیدا کردن ڕەچاو کردووە،ئەگەر بچی تە لای پسپۆڕی قورگ و گوێ دەتنێرێ بۆ لای دکتۆری ددان و ئەویش بۆ لای دکتۆری گورچیلە و ئەویش بۆ لای پسپۆڕی دڵ بەو ناوەی کە دکتۆرەکان دڵنیا بنکە هیچ کام لە ئەندامەکانی لەشت توشی نەخۆشی نەبوون.خۆم کرد بە دەلالی دکتۆرەکان...ڕۆژی چەند نەخۆشێکم دەبرد بۆ لای پزیشکە پسپۆڕەکان و پارەیەکی باشم لێ وەردەگرتن،دکتۆرەکانیش ئەو کارەی منیان زۆر پێ باش بوو،هەمیشە وایان لە نەخۆش و کەس و کارەکانیان دەگەیاند کە با خاتری من هەم پارەیان کەمتر لێ دەسێنێ،هەم نەشتەرگەری باشتریان بۆ دەکەن.یەکێك لەو دکتۆرانە بڕیاریدا خوێنەکەم بۆ بگۆڕێ.کە بۆ من قرانێکی تێ نەچوو،چونکە لەو خوێنە زیادەی نەخۆشەکان کە نەشتەرگەرییان بۆ دەکرا بێجگە لەوەی کە مانگی چەند بوتڵێکم دەفرۆشت،حەوت دانەشم بۆ گۆڕینی خوێنەکەی خۆم پاشقول دابوو...دوای گۆڕینی خوێنەکەم،یەك ڕۆژەم دوو ڕۆژە بوو،ئاسەواری نەخۆشیم پێوە دیار نەما...وای لێ هات بووم بە ناسراوترین دەلالی پزیشکەکانی ئەنقەرە...لە ماوەی چەند ساڵێك سەد بەرامبەر ئەو پارەیەم دەست کەوتەوە کە باوکم بۆ نەخۆشییەکەی من دابوی بە دکتۆرەکان...دوایی بە هۆی ڕاپۆرتێکی پزیشکی و بڕێك بەرتیل گەڕامەوە سەر کاری پۆلیسی و هەموو ئەو موچەیەشم وەرگرتەوە کە

فەوتابوو.کارەکەم گواستەوە بۆ نەنقەرە.مانگی بڕێك پارەم دەدا بە ئەفسەرەکەم.تەنها سەری مانگ بۆ موچەکەم دەچوومە فەرمانگە...جوانترین ئۆتۆمبێل و جوانترین خانوم کڕی،پارەیەکی زۆریشم لە بانکدا دانابوو...سەیری چارەنوسی بنیادەم کەن بەو نەخۆشییە کوشندەیە نەمردم.تا شەوێك بە سەرخۆشی لە ڕێگای گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە خۆم کێشا بەو کۆمەڵە خشتەی کە گەلآبەیەك لە ناوەڕاستی جادەکە هەڵی ڕشتبوو،دەم و دەست گیانم سپارد.ئەوەتا هێناویانم بۆ ئێرە...

مێشە کەرانەی نازدار:ویستم چەند ڕستەیەکی پڕ پێکەنین لە بەسەرهاتی ئەو پۆلیسە هەڵبژێرم و بۆت بنێرم،تا هیچ نەبێ تۆزێك مۆتەکەی ژیانت لە کۆڵ کەمەوە بەلآم لەبەر تاڵی بەسەرهاتەکە نەم ...توانی بە داخەوە...

هەردوو چاوە شینەکانت ماچ دەکەم...

بە هیوای دیدار

دڵسۆزت

((کەری تۆپیو))

## ((نامەی نۆزدەهەم))

## ((کەری تۆپیو باسی ناشتنی خۆی دەکات))

مێشەکەرانە:ژیان لێرە زۆر ئارام و خۆشە،تەنها شتێ کە ئێمە ناڕەحەت دەکات،ئەو کەسانەن که بە دوای مردووواندا دەگەڕێن،بۆ نمونە پیاوێك ژنەکەی بزر بووە،ئایا خۆی خستبێتە دەریاوە یان ئۆتۆمبێل لێی دابێ..ژنێك کچەکەی لەماڵەوە هەڵاتووە بێ سەر و شوێنە،بەڵێ هەمیشە ئەو جۆرە کەسانە سەردانی مەیتخانە دەکەن...دوێنێ ئێوارە لاوێکی لاوازی ڕەنگ زەرد هاواری لێ هەستادەیگووت بەڕاستی بێزارم لێرە،وەك ئۆتۆمبێلی ناو پێشانگامان لێ هاتووە بۆنیتمان هەڵدەداتەوە و بە ئارەزووی خۆیانی سەیرمان دەکەن.گووتم:بابە تۆ دوو ڕۆژە هاتووی بۆ ئێرە،خۆ تۆ هۆکاری مردنەکەشت زانراوە.لەوانەیە هەر ئەمڕۆ لێرە لاتبەن و بە خاکت بسپێرن،لاوە ڕەنگ زەردەکە گووتی:نە بابە تۆ ئاگات لە کێشەی من نییە،دایکم داوای لەسەر چەند دکتۆرێك تۆمار کردووە،کە بونەتە هۆی مردنی من هەتا دادگا ئەو کێشەیە یەکلا نەکاتەوە من هەر لێرە دەمێنمەوە..مێشە کەرانە تەماشای ئەو لاوە قوڕ بەسەرە بکە،ڕۆژێك دوای نان خواردنی نیوەڕۆ.گەدەی توشی ئازار

دەبێت،دایکی دەیبات بۆ خەستەخانە دکتۆرەکان دەڵێن کورەکەت توشی ڕیخۆڵە کوێرە بووە.نەشتەرگەری بۆ دەکەن بەڵام ئەو کورە ئازاری تەواو نابێ و چاك نابێتەوە،دووبارە دایکی دەیباتەوە هەمان خەستەخانە.لە ترسی ئەوەی نەکا شتێك لە ناو ورگی بەجێ مابێ...دووبارە هەڵیاندڕییەوە.بەڵام هیچ شتێکی نامۆیان نەدۆزییەوە.بۆیە دووبارە ورگیان دروەوە.ئەو لاوە بەستەزمانە ڕۆژ بە ڕۆژ وەکو مۆم دەتوایەوە.. ناچار دایکی بردی بۆ خەستەخانەیەکی تر،کاتێ ناردیان بۆ بەشی تیشك،شتێکی نامۆ لەسەر شێوەی نیشانەی پرسیار((؟))لە وێنەکەدا دەرچوو بوو...بەڵێ لە کاتی جێ بە جێ کردنی نەشتەرگەری دووەم مقەستێك لە ناو ورگی کورە ڕەنگ زەردەکەدا بەجێ مابوو...بۆ مێشە کەرانە پێت وایە ورگی ئادەمیزاد کاڵەکە هەرچی بێ چەقۆی لێ نێ و قاشی کا؟زۆر سەیرە خۆ هەرگیز دکتۆرەکان شتیان لە بیر ناچێ،تەنانەت پارەی دەنکە حەبێکیش،ئەی بۆ زۆر جار شتیان بە ناو ورگی نەخۆشەکاندا لەبیر دەچێ؟کاتێك بۆ جاری سێیەم کورەیان بردەوە بۆ ژووری نەشتەرگەری و بێ هۆشیان کرد و خستیانە سەر مێزێکی گەورە و دەستیان کرد بە هەڵدڕینی.کارەبا کوژایەوە،دکتۆرەکان هاواریان کرد خێرا مۆلیدە داگرسێنن،بەڵام دەنگی نەبوو،قوربان مانگێك دەبێ دڵۆپێك بەنزین بێرەدا نەهاتووە.کاکە فریا کەون،چرایەك،مۆمێك...هەر چۆنێك لەبەر شقارتە بە بێ ئەوەی مقەستەکە دەربێننەوە ورگیان درووەوە...هەر لەو کاتەدا لاوەکە گیانی سپارد و کۆتایی بە ژیانی عەزیزی هات...دایکەکەشی داوای لەسەر بەڕێوبەری کارەبا و کار پێکەری مۆلیدە و چەند دکتۆرێك تۆمار

کردبوو...مردوویەکی پڕ بە دەنگێکی بەرز گووتی:ئەرێ براینە من چەند شەوە گوێ لەبەسەرهاتەکانتان دەگرم،دە ئێوەش کەمێك گوێ لە من بگرن باوەڕ بکەن مردنی من لە مردنی هەمووتان سەیرترە،دەستی کرد بەگێڕانەوەی:ساغ و سەلیم بووم،پێم شك نایە لە هەموو ژیانمدا ڕۆژێك نەخۆش کەوتبم...کوڕەکەم هەموو ڕۆژێك یەخەی دەگرتم،بابە گیان...تۆ زۆر کەمتەرخەمی بەرامبەر بە تەندروستی خۆت!منیش دەمگووت:کوری شیرینم کە من هیچ نەخۆشییەکم نەبێ،ئاخر بۆ کەمتەرخەمم؟کوڕەکەم دەیگووت:بابە گیان لە ناو کۆمەڵگای پێش کەوتوو،هەموو کەس شەش مانگ جارێك سەردانی دکتۆرەکان دەکەن بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە نەخۆشییەکیان هەبێت.ڕازییان کردم کە سەردانی دکتۆرێکی هاوڕێم بکەم،کە بڕوانامەی پسپۆڕی لە ئەمریکا وەرگرتبوو،ناردینی بۆ بەشی cheek_up واتە ئازمایشی گشتی...

ئازمایشی خوێن،میز،پیسایی،وێنەی تیشکی و هێڵکاری دڵیان بۆ کردم...کاتێك سەیری ئەنجامەکانی کرد،بە کوڕەکەمی گووت:پێم سەیرە باوکت هەتا ئێستا چۆن ماوە؟تا ئێستا سێ جار توشی فشاری دڵ بووە...گووتم:دکتۆر تۆ دەڵێی چی؟ئەفشاری خوێن؟ئەی چۆن من نەمزانیوە؟دکتۆر گیان پێم خۆشە چاك بزانی من هەرچی نەخۆشی هەیە نیمە بە هەر حاڵ لەگەڵ کوڕەکەم چووم بۆ لای دکتۆرێکی خۆ وڵاتی،کە سەیری هێڵکارییەکەی کرد دەستی کرد بە پێکەنین،ترسی ناوێ چونکە ئەو دکتۆرانەی کە لە ئەمریکا و ئەورروپا دێنەوە لە ئامێری هێڵکاری ئێرە نازانن،چونکە لە لای ئەوان کارەبا بەرز و نزمی ناکات...ئەو بەرز و نزمییەی لە هێڵکارییەکەدا هەیە،هی کارەبایە نەك فشاری خوێن...خۆم

و کورەکەم دڵنیا بوورین و بەرە و ماڵ ڕۆشتینەوە،بەڵام لەو ڕۆژەوە توشی بیرکردنەوە و دڵە ڕاوکێ بووم.وردە وردە نەخۆشیم لیّ بە دیار کەوتن هیزم لیّ برا و توشی نەخۆشی دەرونی بووم،تا لە خواردن کەوتم،جوڵەم نەما،مردم و عومری درێژم بۆ ئێوەو کورەکانم بە جێهێشت.کورینە مردنی من سەیرە..!پێم وایە ئەگەر نەچووبام بۆ ئەو شوێنەی کە لە وڵاتانی پێش کەوتوو،هەر شەش مانگ جارێك خەڵك دەچن ئازمایشی خۆیان دەکەن زۆر لە ئێستا زیاتر دەژیام..!

لە یەکێك لە خانەکاندا مەیتی کچێکی زۆر جوانی تێدا بوو...کە سیخوار قژ و برژانگەکانی گرتبوو.لێم پرسی بە چی مردووی؟گووتی:مردنی من ڕۆمانێکی دڵتەزێنە،لەو جۆرە ڕۆمانانە لە وڵاتی ئێمە زۆرن وەك پلەی گەرما و نرخی زێڕ و ڕۆژ نییە چەند دانەیەکیان لیّ بڵاو نەبێتەوە.لە بارەی ژیان و مردنی من شتی سەیر و سەمەرەیان بڵاو کردەوە،بۆ نمونە ڕۆژنامەیەك نوسیبووی بەمزوانە بیرەوەرییەکانی خوالێخۆشبوو دەکەوێتە بازارەوە،کە من لە ژیانمدا تەنها وشەیەکیشم نەنوسیوە...نەریّ بە ڕاست جوانییەکەم ماوە؟بەڵیّ جوانییەکەت وەك خۆیەتی،چونکە ئەو گوڵلانەی کە لێیان داوی بە دەورو بەری مایۆکەت کەوتون،بێجگە لەوەش هەر کە تۆیان هێنا بۆ ئێرە تۆم ناسییەوە،هەموو ڕۆژیّ کە کارمەندانی مەیتخانە ڕۆژنامەیان دەهێنا ژووریّ،وێنەی تۆیان بە گەورەیی بڵاو دەکردەوە دەربارەی ژیان و مردنی تۆ دەیان نوسی...گووتی:بەڵیّ ڕاستە بەڵام ئەوەی ڕۆژنامەکان دەیاننوسی فریان بەسەر ژیان و مردنی ڕاستەقینەی منەوە نەبوو...بە چیرۆکیش ئەو شتانەم نەبیستبوو...!بەڵیّ مێشە کەرانەی ئازیز...من

مردم و تۆش له دنیا له شوێنی منی نازانم بێ من دەرزییە تیژەکەت لە کوێ دەچەقێنی؟میشە خۆشەویستەکەم:ئەگەر بێی بۆ ئێرە و سەرێکم لێ بدەی بۆ حاڵی من گریانت دێ،لێوەکانم وشك هەڵتوون وەك گەڵای گوڵی نێوان پەڕەکانی کتێب دوو دڵۆپ فرمێسك بەسەر هەردووك چاوەکانمەوە مەیبون هەرچەندە بەو مردنەم خەڵکێکی زۆر لە دەستم ڕزگاری بوو،ئەوانەی چاویان پێم هەڵنەدەهات،ئەوانەی حەزیان نەدەکرد سڵاوم لێ بکەن،یان ئەو دراوسێیانەی کە ئۆتۆمبێلیان هەبوو کە دەگەشتنە ڕاستی من خۆیان بە شتێکەوە دەخلافاند گوایە منیان نەدیوە...منیش ڕزگارم بوو لە لۆمە و پاشقولی ئەوان...بەڵام دڵنیام ئێستا دەڵێن:خوای لێ ڕازی بێ بە ڕاستی پیاوی چاك بوو،تا بڵێی پیاوێکی نوکتە باز و قسە خۆش بوو...بەیانی زوو دەرگاکان کرانەوە،بە فەرموو فەرموو کۆمەڵێك قوتابی کۆلیجی پزیشکی بە دوای پرۆفیسۆرێکدا هاتنە ژووری،بە هاوکار فەرمانبەرانی مەیتخانە منیان دەرهێنا و لەسەر مێزێك دایاننام،پرۆفیسۆرەکە لەسەر من دەستی کرد بە وانە وتنەوە لەکۆتاییی وانەکەدا دوو سێ مشتە کوڵەی کێشا بە سەرمدا و ڕووی کردە قوتابیان:ئەوە کەللە سەری مرۆڤە،لە ناو کەللە سەردا مێشك هەیە هەر مرۆڤێك نەزانێ بەکاری بێنێ لە ژیاندا چەندین کێشە و چەرمەسەری دێتە ڕێی...ئەوەی کە بزانێ بە کاری بێنێ بە سەرفرازی ژیان دەباتە سەر...وانەکە تەواو بوو...مێشە کەرانەی نوك تیژ:وەکو دەزانین کەری تۆپیو چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنن و دەیخەنە ناوی و کەمێك گڵ و خۆڵی بە سەردا دەکەن...بەڵام ئەوەی لە من ڕوویدا شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو،بە ئۆتۆمبێلێکی ڕازاوە بە گوڵی

سروشتی بردیانم بۆ گۆڕستان و زیاتر له دوسەد ئۆتۆمبێل دوای تەرمەکەم کەوتبوون.کە گەیشتینە گۆڕستان ئەو هەموو حەشامەتە دابەزین و هەر یەك دەسکە گوڵێکی گەورەی لەسەر دارە مەیتەکەم دانا...مێشە ئازیزەکەم..باوەڕت بێت بووم بە ژێر خەرمانێکی گوڵی سروشتییەوە.کە دەمروانییە غەمباری خەڵکەکە دەمگووت ڕەنگە بە هۆی ئەو چەند چیرۆکەوە بێت کە لە ژیانمدا بڵاوم کردبوونەوە،بەڵام تەنها کەسێکی ڕۆشنبیر و کتێبتارم لە ناو قەرەباڵغییەکەدا نەدی...هەموو پیاوی دەوڵەمەند و سەرۆکی فەرمانگەکانی دەوڵەت بوون...وتار خوێنی مزگەوتی گەورە هاتە سەرینم دەستی کرد بە پێدا هەڵدانی من.بە ڕاستی سامانێکی گەورەمان لە دەست چوو...ئەو پیاوە سەروەرە چل ساڵ پێش ئێستا توانی یەکەم کارگەی بنێشت لە ئەورووپاوە بێنێ و لە وڵاتی خۆماندا دایبمەزرێنێ.بە هۆی دەوڵەمەندی و زۆری کارگەکانی هەتا ئێستا چەندین ملوێن باجی داوە بە دەوڵەت...بە ڕاستی ڕۆڵەی بە ئەمەکی نیشتمان بوو،لەو کاتەدا یەکێك هاواری کرد:مامۆستا گیان بوەستە،وتارەکەت ڕاگرە،هەرچەندە مردوو لە هیچ ناترسن بەڵام من زۆر ترسام لەوەی جارێکی کە لە گۆڕەکەم دەرم بێننەوە و بمبەنەوە بۆ ناو ساردخانەی مەیتخانە...کابرا دووبارە هاواری کرد:مامۆستا برایان وەرن بۆ ئێرە،تەرمی پیرۆزی جەنابی جەعفەر بەگ پاشا ئەوەتا لێرەیە...!هەی لەوەی دەسکە گوڵی خۆی لەسەر گۆڕەکەی من بفڕێنێ و بیباتە سەر گۆڕی جەعفەر پاشا...!سەر گۆڕەکەم چۆڵ بوو مەلا نامەردەکەش نەیکرد تەڵقینم بدا ئینجا بڕوا...مێشە گیان منیان بە بێ تەڵقین بە خاك سپارد.دواین کەس کە

گۆڕەکەی منیان بەجێ هێشت بەڕێوبەرەکەم شەریفی و ژمێریاری بوون.خێراکە شەریف با بڕۆین.ئەوەی ناشتمان تەرمی ئەو گۆڕ بە گۆڕەیە کە پەنجا لیرەمان دا پێی.وەک کەری تۆپیو پەنجا لیرەکەی خوارد،مێشە کەرانە گیان:بە ناچاری گووتم ئێستا دوو فریشتەی خوام دێنە سەریێ...خوا هێدایەتم بدا.خوا بەزەیی پێمدا بێتەوە...فاتیحا...
لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم

((کەری تۆپیو))

خامەی بیستەم ))

من لە ژیانمدا هەرگیز هەستم بە بێزاری و ناڕەحەتی نەکردووە...هەر کاتێك کە خەوم دەهات یەك ڕاست ڕادەکشام و دەنوستم نەمدەگووت ئێرەیە ماڵەوەیە یان لاڕێگایە،زیندانە،ئوتێلە؟یان باغی گشتییە؟لە هەموو کات و شوێنێك دەمنوسی،لە چایخانە لە ماڵەوە لەسەر مێز،سەر ئەرز،لەسەر پێخەفەکەم،لەسەر ئەژنۆم،بە پێچەوانەوە زۆر لە نوسەرەکان تا کەش و هەوایەکی زۆر باشیان بۆ نەڕەخسابا،نەیاندەتوانی بنوسن...بەڵام نوسەرێك هەبوو نە ماڵی هەبوو نە حاڵ،تەنانەت شوێنی نوستنی نەبوو،نازانم ئەو هەموو شیعر و چیرۆکە نایابانەی چۆن و لە کوێ دەنوسین.هەر کە ئەو نوسەرەم بیردەکەوێتەوە،ئەو سرودەم دێتەوە یاد.کە لە قوتابخانەی سەرەتایی فێریان کردبووین...کە دەمانگووت:ژێرمان خاکە و سەرمان درەخت و ئاسمان،دەڕۆین و ڕاناوەستین،لە تێ کۆشان...

مێشە کەرانە:بە ڕاستی ناو گۆڕەکە هەتا بڵێی خۆش و بێدەنگ بوو کاتێك پشتم سڕ بوو،ویستم تۆزێك قاچم ڕاکێشم،دەنگێکی ناقۆڵا لە ژێرمەوە هات...کوڕە زۆر جوڵە جوڵ مەکە نابینی من لە ژێرتەوەم؟گووتم:جا بۆ هاتویە ژێر من؟من نەهاتومە ژێر تۆ،تۆ هاتویە سەر من...گووتم:من بۆ خۆم نەهاتووم،هێنایانم،باشە هەموو دوو

کاتژمێر نابێ هاتوویە ئێرە،زمان درێژی مەکە،خۆ ئێرە ماڵی باوکت نییە،گووتم:ئێمە بۆ هەتا هەتایە بووین بە دراوسێ،تۆزێك دەنگ و دۆرت خۆش بێ،خۆ تاپۆی باوکی تۆش نییە،گووتی:ڕاست دەفەرمووی بۆ باوکم بە زیندوویش تاپۆی هەبوو تا بە مردوویی هەیبێ؟بەلأم ئەوەش بزانە لە ژێر منیشەوە ژنێك نێژراوە...کەواتە ئێمە جیاوازی نییە لە نێوان مردن و ژیانماندا،چونکە بە زیندویش سێ سێ لەسەر یەك سەندەڵی لە ناو پاسی گەرەك دەیان ئاخنین...

مێشە کەرانە:ناو گۆڕ بۆ من زۆر ئاساییە،خۆت دەزانی ئێمە هەشت سەر خێزان لە کونە گورگێکدا دەژیاین بەلأم ئەوەی ژێرمەوە زۆر نارەحەت بوو...پێم گووت:ئەگەر حاڵت وایە بۆ گۆڕێکی تایبەتیت نەدەکڕی؟گووتی:بە ئاخێرم لە پێش مردنمدا لە بازاڕی ڕەش نێرەم بە پارەیەکی زۆر کڕی.بەلأم زۆربەی گۆڕ فرۆشەکان فێری تەڵەکە بازی بوون،فەرمووی:من ژنێك لە ژێرمەوەیە پیاوێکیش لەسەرمەوەیە...فێر بوون هەموو گۆڕێك زیاتر لە جارێك دەفرۆشنەوە...بۆ نمونە ئەو پیاوەی کە لە تەنیشت ئێمە نێژراوە،شەو و ڕۆژ ئاخ هەڵدەکێشێ کە لە گۆڕدا چی بەسەرهات؟بەڵێ گۆڕەکەی ئەولاتر گۆڕی ژنەکەیەتی کە چەند ساڵ بە خۆشەویستی و پاکی بەیەکەوە ژیانیان بردە سەر،کە ژنەکەی مرد،گۆڕی تەنیشت ژنەکەشی بۆ خۆی کڕی،کە پیاوەکەش مرد و ناشتیان،دوای ئەوە کە سەیری کرد ژنەکەی لە باوەشی پیاوێکی بێگانەدایە...پیاوەکە زۆر سەرزەنشتی ژنەکەی کرد کە لە دوای مردنی گۆڕاوە و ئەوی بیر چۆتەوە و لە باوەشی پیاوێکی بێگانەدا پاڵ کەوتووە...ژنەکەی پێی گووت:کە دوای مردنی ئەو بە چەند ڕۆژێك

دووباره گۆرەکەیان بەو پیاوە فرۆشتووە و لە پاڵ ئەودا ناشتویانە...ئاوا ئەو ژنە چۆتە باوەشی پیاوێکی بێگانەوە...

مێشە گیان وامەزانی لە دوای مردنمان هیچ جیاوازییەك لە نێوان هەژار و دەوڵەمەنددا نامێنێ.ئەوەی ژێرمەوە گووتی:راستە نامێنێ!بەلآم ئەو رۆژەی مرۆڤ بنە بڕ دەبێ،چونکە هەتا یەك زیندوو لە ژیاندا بمێنێ ناهێڵێ مردووەکان بحەسێنەوە...لە پڕ هاوارم کرد:کورە ئەو شتە لابە کە لە منت چەقاندووە...ئەرێ کاکە دەڵێی تۆ لە کۆشك و تەلاردا ژیاوی،باوەڕت بێ هیچم تێ نەچەقاندووی.من کە زیندوو بووم بە حەوت کەس لە ژوورێکدا دەژیاین،نەدەزانم چیم لە کێ چەقاندووە.نە چییان تێ چەقاندووم.گووتم:کاکە بمبورە تۆ نەبووی،ئەوەتا ئەو بەردەیە لە کەلەکەم چەقیوە...ئەوەی ژێرمەوە گووتی:تۆزێ لەسەرخۆ با ئافرەتەکەی ژێرمەوە گوێی لێ نەبێ...گووتم:جوانە؟ژنەکە بە قرخە قرخ گووتی:بێ دەنگ بن،تۆزێك ڕەوشتتان تێدا بێ و قسەی جوان بکەن...خۆ من ئەگەر ئێستاش جوانیم نەمابێ وەختی خۆی جوانترین کچی ئەم شارە بووم..گوێ بگرن با بەسەرهاتی خۆمتان بۆ باس بکەم...پیاوەکەی ژێرمەوە گووتی:ئەرێ نەبرایەوە لەوەتەی من هاتووم پەنجا جارت ئەو بەسەرهاتە گێڕایەوە...ژنەکە گووتی:تۆ گوێ مەگرە من بۆ ئەو پیاوەی سەرەوەی باس دەکەم،خۆ ئەو گوێی لێی نەبووە...

مێشە کەرانەی خوێن خۆر:بە گوێرەی قسەکانی خۆی ئەو ژنە ئافرەتێکی یەکجار جوان بووە.لە سەرەتایی لاویەتی چوار شوی بە چوار پیاوی زۆر دەوڵەمەند کردبوو...لەبەر زمان درێژی خۆی تا تەمەنی بووە بە سی ساڵ چوار جار تەلاق دراوە...هەر جارەی

مارەییەکی زۆر باشی لە مێردەکانی ستاندووە.دوایی شوی بە پیاوێکی پیری دەوڵەمەند کردووە.کە کابرا دەمری میراتێکی زۆر زۆری بۆ بەجێ دەمێنێ،وەکو بۆ خۆی دەیگووت کە ئافرەتێکی زۆر دڵ تەڕ بووە.بە هۆی ئەو پارەیەی کە دەستی کەوتبوو کام لاوەی پێ قۆز با دڵی بۆ لای خۆی رادەکێشا...چەند ساڵێك پێش مردنی لاوێکی هەژاری یەکجار جوان خۆشەویستی خۆی بەرامبەر بەو ژنە پیشان داوە،بە هیچ جۆرێك داوای پارە و پولی لێ نەکردووە...دوای ئەوەی ژنەکە توشی نەخۆشییەکی کوشندە دەبێ،ئەو لاوە جوانە لە خۆی ناگۆڕێ و وەك مێردێکی بە وەفا هەمیشە لە ژوور سەری دەبێ و خزمەتی دەکات...

مێشە کەرانەی خوێن خۆر:ئەو ژنەش لە وەفای ئەو هەموو خزمەت و چاکەیە کە مێردە لاوە جوانەکەی لەگەڵی دەکات،سەنەدێکی داد نوسی بۆ مۆر دەکات کە لە پاش مردنی هەرچی هەیەتی لە خانو و کارگە و پارە هەمووی بۆ مێردە جوانەکەی بێت.بە هەر حاڵ ژنەکە دەمرێت.وەکو ژنەکە بۆ خۆی دەیگووت لە دوای مردنی تەنانەت کفن و گۆڕیشی بۆ نەکڕیوە و ،شارەوانی بە خێری خۆیان هێناویانە لەو گۆڕەدا بە خاکیان سپاردووە...جارێك لەسەر داوای ئەو ژنەی کە بە پارە و ماڵی من هێنابووی هاتنە سەر گۆڕەکەم،ژنەکە گەلێك نزا و پاڕانەوەی لە لای خوا کرد کە بم بەخشێ و بە بەهەشتی بەرینم شاد بکات...کەچی ئەو مێردەم کە لە ژیاندا ئەوەندە منی خۆش دەویست و خزمەتی دەکردم تەنها نزایەکی خێری بە دەمدا نەهات،تەنانەت فاتیحایەکی بۆ نەخوێندم...ئێستا زانیم کە ئەو لاوە،بە پیشاندانی خۆشەویستی و دڵسۆزی دەستی بەسەر ماڵ و سامانی مندا گرت...

میشە کەرانە:رەنگە باوەڕ نەکەی کە بڵێم چەند تامەزرۆی دیداری تۆم.داواکارم کە بەو زوانە بە دیداری یەکتری شاد بین. .هەقتە ئەگەر باوەڕ نەکەی مردوو و دیدار کوجا مەرحەبا بەلام بە یەك دەگەین...تۆ بڵێ چۆن؟کاتێك کە چاوت بە کەرێکی زیندوو کەوت لە لاپاڵێك دەلەوەڕێ،بە یادی من بۆی بفرە و دەرزی لە لاملی بچەقێنە و یادی من بکە...منیش لێرەوە بە خەیاڵ دێمە ئەو لا پاڵە چۆڵە،کە ئێمەی هەژار تەنها لەو جۆرە شوێنانە هەستمان بە ئازادی دەکرد...لە کۆتایی نامەکەم جوانترین سلاو بۆ دەرزییەکەت کە لە پشت ملی دەوڵەمەندەکانی ڕادەکەی،بە تامترین ماچیش بۆ خۆت ئەی مێشە کەرانەی خوێن شیرین...

هاوڕێی دڵسۆزت

((کەری تۆپیو))

((نامەی بیست و یەکەم))

خوشکی ئازیزم مێشە کەرە:لەسەر گۆڕەکەم تەپە تەپێك پەیدا بوو،دیار بوو دەنگی پێی مرۆڤەکانە...ئەوەی ژێرمەوە گووتی:دەزانی شەو درەنگە..!گووتم:تۆ لە ژێر ئەرزی،چۆن دەزانی شەوە یان ڕۆژ؟گوێت لەو تەپە تەپە نییە ئەوانە یان کفن دزن یان کێل دز...هێندێك لەوانە کە کێلی گۆڕەکان دەتاشن دێن هەر لێرە گۆڕی کەسێکی مردوو سەر لە نوێ دەتاشنەوە،بە ناو و نیشانێکی تازە سەر لە نوێ دەیفرۆشنەوە...گووتم:بۆ ئەم گۆڕستانە پاسەوانی نییە؟بەڵێ هەیەتی بەڵام لەگەڵ دزەکان شەریکە...گووتی:لەبەرئەوەی تۆ تازەیت ئاگات لە حاڵی گۆڕستان نییە،چەپکە گوڵی سەر گۆڕەکان دەدزن.کۆمەڵێك دز هەن تەنها تاقمی ددانی زێڕ و پلاتینی ناو ئێسقانی مردووەکان دەردێننەوە و دەیفرۆشن...دوای چەند کاتژمێرێك گووتم:ئەرێ ڕۆژ نەبۆتەوە؟گووتی:شەو و ڕۆژت بۆ چییە؟ئێستا ئێمە لە دەرەوەی بازنەی کاتداین...لەو کاتەدا دەنگی دارمانی خاکێك هات،پێی گووتم:ئێستا نزیکی نیوەڕۆیە،گوێت لە دەنگی پاچ و خاکەناز نییە؟لە سەروو ئێمەوە

یان لە تەنیشتمان خەریکی هەڵکەندنی گۆڕێکن...هەژاریکی وەك ئێمەی تیّ فڕێ دەدەن،بە ڕاستیش ئەوە ڕووی دا،ئەو گڵەی کە بەسەر لاشەی مندا کرابوو هەڵیان دایەوە و...تەرمی پیاوێکی پیریان لەسەر من درێژ کرد،هەر وەك خویّ بکەن بە خەیارەوە گڵەکەیان کردەوە بەسەر کابرای مردوودا...ئەوانەی کابرایان ناشت،دوو یان سیّ کەس دەبوون زیاتر نا...دیسان بیّ دەنگی باڵی بەسەر گۆڕستاندا کێشایەوە،چوینەوە دەرەوەی بازنەی کات.مردووی ژێر من لە مردووە تازەکەی پرسی:کاکە هۆکاری مردنەکەت چی بوو؟مردووە تازەکە بە نوزە نوز گووتی:بەخوا هۆی مردنەکەم نازانم،بەلاّم بە گوێرەی مشت و مڕی دکتۆرەکان کە لێم کۆ ببونەوە،یەکێکیان دەیگووت:باشترین نەشتەرگەری بۆ کردووە دەستی خۆش بیّ...ئەوی کەیان دەیگووت پیرۆزبایی لیّ دەکەم بۆ ئەو نەشتەرگەرییە سەرکەوتووە،بەلاّم بەستەزمانە چی بکات،پێش ئەوەی بیهێنن بۆ هۆڵەکە دەرزی ((کۆرتی زۆن))یان لێداوە...منیش پێم گووتن:لێتان تێناگەم بۆم ڕوون بکەنەوە...!دکتۆرێکیان گووتی:تۆ باشترین نەشتەرگەریت بۆ کراوە.بەلاّم دکتۆرەکە ڕاپۆرتەکەی نەخوێندۆتەوە کە تۆ ئەمرۆ نابیّ نەشتەرگەریت بۆ بکریّ.بەلاّم خۆ تۆ لە تەمەنی حەفتا و شەش ساڵیدا مردووی تا توانیوتە ژیاوی،ئەگەر ئەش مردبای پێم ناڵێی دوای ئەو تەمەنە چیت دەکرد؟مردووە تازەکە بیّ دەنگ بوو،دوای کەمێکی کە بە دەنگ هاتەوە:ئەریّ ئەم گۆڕە چەند کەسی تێدایە؟گووتم:بە تۆوە چوار لە ژێر منەوە پیاوێك هەیە،ئەویش ژنێکی لە ژێرەوەیە...هەر خواش دەزانیّ لە ژێر ژنەکەش چەند مردووی کەی لێیە.گووتی:چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی بمرم لە ڕۆژنامەیەکدا

راپۆرتێکم خوێندەوە نوسرابوو،ئەگەر ڕێژەی منداڵ بوون کەم نەکەینەوە دوای چەند ساڵێکی کە شوێن نامێنێ مردووەکانی لێ بشارینەوە...کابرا دەستی کرد بە باس کردنی سودەکانی کەم کردنەوەی منداڵ...دەیگووت:ئەگەر لە ولاتی ئێمە دوو ملیۆن کەس بژی هەموو کەس دەبێتە خاوەن خانو...ئەوەی ژێرمەوە قاقایەکی لێدا،گووتی:بۆ لە ولاتی ئێمە دوو ملیۆن کەس هەن کە وەك مرۆڤ بژین؟گووتم:باشە ئێمە بۆ سەری خۆمان بە زیندووەکانەوە بییەشێنین؟ئەوەی ژێرمەوە گووتی:تۆ بۆ لە باسی زیندووەکان دەترسیٚ؟نەتبیستووە؟((کەری تۆپیو لە گورگ ناترسیٚ))لە دڵی خۆمدا گووتم بلێی ئەو پیاوە هیچ لەبارەی ژیان و مردنی من بزانیٚ؟لەو کاتەدا دەنگی جۆق و مۆسیقا لە نزیك گۆڕەکەی ئێمە بەرز بۆوە...ئەوەی ژێرمەوە گووتی:توخوا بیٚ دەنگ بن،با بزانین ئەو مۆسیقایە خۆشە چییە؟نای داخەکەم ئەوە یەکێکە لە خۆشترین ئاوازەکانی((شۆبان))تا دەهات ئاوازەکە لە گۆڕەکەی ئێمە نزیك دەبۆوە.هەستم دەکرد کە بە سەر ئێمەدا دەڕۆن...گۆڕەکە لەبەر دەنگی لێدانی تەپڵ و تەپەی قاچی مۆسیقا ژەنەکان دەلەرییەوە وردە وردە لە ئێمە دوور کەوتنەوە.دیار بوو تەرمی پیاوێکی دەوڵەمەندیان بەرەو گۆرستان بە ڕیٚ دەکرد...

خۆشەویستم مێشە کەرانە:ئێرەش وەك شارەکەی خۆمان وایە،گەڕەکی دەوڵەمەندەکان جیایە لە گەڕەکی هەژارەکان.مێشە گیان:داواکارییەکم هەیە...!ئەگەر پارەی زیادت لایە،بەڵکو پەنجا لیرەم بۆ بدەی بە بەرێوبەرە کۆنەکەم...ئەو ڕۆژە کە لەگەڵ تەرمی((جەعفەر پاشا))هاتبوو

بۆ گۆڕستان.ئەوەندە چاوم شۆڕ بوو بەرامبەری، باوەڕت بێ لە ڕووم نەهات سلاوێکی لێ بکەم و بڵێم:گەورەم چۆنی هەر لە خۆشیدا بی.

برات

((کەری تۆپیو))

((نامەی بیست و دووەم))

هاوڕێی گیانی بە گیانیم.مێشە کەرانە نازانم چەند لە گۆڕدا مامەوە،بەڵام ڕۆحەکانمان شەو و ڕۆژ دەڕۆیشتن،گەشتینە جێگایەك،دەیگووت شوێنی بڕینی بلیتی دنیای خۆمانە.بەڵێ لەسەر ئەنجامدا لاشەکان ڕزین و بوون بە خاك و خۆڵ،ڕۆحەکان بە کارەکان هەڵدەستان...بۆچونەکەم وە ڕاست گەڕا لەوێش شوێنێك هەیە بلیتی کردارەکانت دەدەنە دەست کەدیتم بە هەزاران کەس لەبەردەم شوێنەکە ڕیز بوون منیش وەك ئەو خەڵکە چوومە ڕیزەوە.هەر کەسێ کە بلیتی خۆی وەردەگرت،دوو فریشتە قۆڵیان دەگرت و دەیان برد بەرەو شوێنێکی نادیار...مێشە کەرانە دەزانی ئەو کچەی کە لەوێ بلیتی دەبڕی ناسیمەوە..!((فریشتە خان)) ی بلیت بڕ بوو،کە لە ژیانیشیدا دەیان ساڵ بوو خەریکی ئەو کارە بوو...هاوارم کرد:فریشتە خان،ئەوە منم لێرەم..!دەنگێکی ترسناك لە ژوور سەرمەوە هات،بێ دەنگ بە کوڕە،جوان ڕاوەستە.خاوەنی دنگەکەم نەدی دەتگووت دەنگەکە لە ئاسمانەوە دێ..کە فریشتە خان سەری هەڵبڕی و سەیری کرد،لە دڵی خۆمدا گووتم:خوایە گیان خۆ کە من مردم فریشتە تەمەنی پەنجا ساڵ زیاتر بوو،چۆن وا جوان و گەنج بۆتەوە؟کە نۆرەم هات و گەیشتمە بەردەمی فریشتە خان لە لای چەپمەوە بلیتێکی سوریان دایە دەستی چەپم منیش بلیتەکەم دایە فریشتە خان.بە ترسەوە گووتم:فریشتە خان نامناسییەوە؟وەکو هەر گوێی لە من نەبووبێ،گووتی نامەت

پێیە؟گووتم:نامەی چی؟نامەی پیاوێکی گەورە؟گووتم:بە داخەوە هیچ جۆرە نامەیەکم پێ نییە...لە ناو و نیشانمی پرسی گووتی:کەمێك چاوەڕێ بە پەنجەی نا بە دوگمەیەکدا،دۆسیەیەکی گەورە هاتەبەردەمی کە وێنەی مانگی یەك شەوە لەسەر بەرگەکەی بوو.مۆرێکی سووری لێ درابوو لە ژێرەوە نوسرابوو...((زۆر نهێنی و تایبەت)) لە ناو لاپەڕەکانی دۆسییەکە دەنگە دەنگ و چرپە چرپ دەهات:ئەوەتا،خۆیەتی،بەڵێ ئەوە..فریشتە خان گووتی:ئەوە تۆی؟بەڵێ منم نامناسییەوە؟جارێکی کە دەستی نایەوە بە دوگمەکەدا..دەم و دەست فریشتەیەکی دۆزەخ هات...قۆڵی گرتم و بردمی بۆ ژوورێ لێکۆڵینەوە...دوو دەست لە دیواری ژوورەکە هاتنە دەرێ و وەك گاز گرتیانم.دەنگێکی قەبەی ترسناك لەدیوارەکە هاتە دەرێ گووتی:ئەزانی ئەو دەستە کێیە تۆی گرتووە؟ئەوە دەستی دادپەروەرییە،دادپەروەری...!لە هەر شوێنێك بی دەتگاتێ،لە گۆڕستان،تەنانەت لە دۆزەخیشدا.

مێشە کەرانە:ئەو هەموو بەسەرهاتە کەچی نەخۆم نە کەسیشم دی دەم بکاتەوە،هەموو شتێك لەوێ ڕۆحییە.دیارە لێرەش دەستی دادپەروەری هەر دەگاتە هەژاران.دوایی هێنایا نەمەوڵێکی زۆر گەورە،خەڵکێکی یەکجار زۆر دانیشتبوون،گووتم:بەڵکە خزمێك یان ناسیاوێکی خۆم ببینم،لەبەردەمی ئەو خەڵکە ئافرەتێك دانیشتووە هەردووك چاوی بەسراوەتەوە...تەرازوویەکی لە بەردەم دانرا بوو..!لەوەی بەردەمم پرسی:ئەوە کێیە؟گووتی:ئەوە فریشتەی دادپەروەرییە،گووتم:ئەی بۆ چی بەسراوەتەوە؟بۆ ئەوەی کەس نەبینێ و جیاوازی نێوان هیچ کەسێك نەکات.بۆ ئەوەی کە کوڕێکی شۆخ و شەنگ هاتە بەردەمی بە

گوێرەی کردارەکانی دادگایی بکات.بەڵام لەوێ شتێکی زۆر سەیرم دی ئەویش ئەوە بوو کە پیاوێکی زۆر ناشیرین و ڕەزا گرانم دی لە دوای فریشتەکەوە وەستابوو جار جارە کراسە ئاوریشمییە سپییەکەی فریشتەی دادی هەڵدەدایەوە و سەری دەکرد بە ژێر کراسەکەی دا و دووبارە سەری دەردەهێنایەوە هاوارێکی دەکرد:کە من نەمدەزانی دەڵێ چی...دووبارە پرسیمەوە:ئەو پیاوە کێیە؟ گووتیان:نایناسی؟ئەو پیاوە بێ شەرەفە , خوێنرییە شەیتانە.!گووتم:ئەی بۆ وا دەکات؟گوتیان:لەبەرئەوەی هەموو ڕۆژێك لێرە سەدان هەزار خەڵك بە ڕێ دەکەن،ئۆرە بڕی لەم دەکەن...گووتم:کەوابێ لێرەش دادپەروەری نییە..یەکێك گووتی:تێناگەی؟هەموو ڕۆژێك فریشتەی داد هاوار دەکات چارەنوسی شەیتان تەنها بە دەستی خوای گەورەیە...نۆرەم هات گەیشتمە بەردەمی فریشتەی داد و تەرازوو لێی پرسیم.هۆی مردنت چی بوو؟لەبەرئەوەی چووم بۆ هاوینە هەوار و ئازادیم هەڵبژارد،گووتی:یەکەم تاوانت ئەوەیە میزت بەرەو قیبلە کردووە،دووەم تاوانت شتی زۆر نا بەجێ و دژ بە ئاینت نوسیوە،لەوەی تەنیشت منی پرسی:لە دنیادا کارت چی بوو؟وەڵامی دایەوە:((پێکهێنەری کاری سێکسی))فریشتەکە گووتی:پێ دەچێ کارێکی دیار و شیاو بێ،ئەو کارە کەرتی تایبەت بوو یان سەر بە یەکێك لە وەزارەتەکان بوو؟کەرتی تایبەت بوو بەڵام پەیوەندیمان لەگەڵ هەموو وەزارەتەکاندا هەبوو،کارتان چی بوو؟کابرا گووتی:ئێمە بازرگانی خۆشەویستی بووین،کەچی گەجەر و گوجەر پێیان دەگووتین((گەواد)) کاتێك دۆسیەی گەوادەکەیان لە ناو تەرازووەکە دانا،دەنگێك لە بەرزاییەوە

هات گووتی.ئەی ئادەمیزاد لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژەی کە لە خەستەخانە لە دایکێکی داوێن پاك هاتویتەتە خواریٚ منالێك لە تەنیشت تۆ لە دایکێکی بی ئابڕوو لە دایك بوو.بە هۆی هەڵەی کارمەندانی خەستەخانەکەوە گۆڕاون.تۆیان داوە بە ئافرەتە بی ئابڕووەکە،تۆ بووی بە گەواد و ئەویش بە پیاوێکی گەورە.لەبەرئەوەی لێرە دادپەروەری سەروەرە بڕیارماندا جێگایەکی تایبەتت لە بەهەشت بۆ دانێین...ڕاستەوخۆ کارتێکی سەوزیان دایە دەستی.بە بەردەمی مندا بەرەو بەهەشت کەوتە ڕیٚ.پێش ئەوەی لە من تێپەڕ بێت پێم گووت:پیرۆزباییت لیٚ دەکەم،کەچی بە تورەییەوە وەڵامی دامەوە،کاکە ڕاستە من بەرەو بەهەشت دەڕۆم بەڵام من لە تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵیدا مردووم واتە چل ساڵ گەوادیم کردووە،ئەگەر لە تەمەنی نەوەد و پێنج ساڵیدا مردبام هەشتا ساڵ گەوادیم دەکرد،جێگایەکی زۆر باشترم دەست دەکەوت.دەنگێك لەسەرەوە هات:لەبەر ئەوەی ((کەری تۆپیو))نوسینەکانی دژی ئایین و خوا بوون لاوانی وڵاتی بۆ پێش کەوتن هان داوە بڕیارماندا بیخەینە دۆزەخەوە...گەوادەکە گووتی:کاکی نوسەر زۆر بە داخەوە،گووتم:سوپاست دەکەم بەڵام کارەکەی من ڕاست پێچەوانەی کاری تۆیە،بریا منیش سی ساڵ ژیابام نەك هەشتا و پێنج ساڵ،ئەوسا فریای ئەوە نەدەکەوتم حەفتا ساڵ بنوسم ڕەنگ بوو ئەوسا هۆدە و هەیوانێکم لە بەهەشت پی بڕابا...

دڵسۆزت

(( کەری تۆپیو))

((نامەی بیست و سێیەم))

((دوایین نامەی کەری تۆپیو کە نایەوێ بە قەرزاری بمێنێتەوە))

دوای ئەوەی دڕسیەکەمیان سەرە و بن کرد،بە تاوانی نووسین ...بڕیاریان دا بم خەنە دۆزەخەوە،بەڵام دۆزەخ بۆ تاوانەکانی من کەم بوو،بۆیە خستیانمە بنی بنەوەی دۆزەخ...

مێشە گیان بیرت دێ لە دونیا چۆن بە دۆزەخ دەیان ترساندین،کە چۆن ئاگر و گەرمی هەراسانت دەکات و داوای شوێنێکی سارد دەکەیت بۆ من هەر وەکو ئەوە وایە درێژە بەژیانی دنیا بدەم سەرمای زستان و بێ نەوتی،گەرمای هاوین و بێ کارەبایی،هیچ نەبێ لێرە کە تاوان بارێکی تازە دێننە ژوورەوە،دەرگا دەکرێتەوە و تۆزێك فێنك دەبینینەوە ئەوەی کە من لە دۆزەخ زۆر پێی دڵشادم کە ئەوەیە مێشە کەرانەی وەك بەڕێزت:بە سالّی تیشکیش ناتوانن لێمان نزیك ببنەوە...لێرە دراوسێ دراوسێ بێزار ناکات بەوەی دەنگی تەلەفزیۆن و ڕادیۆکەی بەرز بکاتەوە...لێرە هەرا و هۆریای منداڵی گەڕەکی لێ نییە،هاواری عەرەبانە چی و شت فرۆشی گەڕۆك نابیستی و جاری وا هەیە کە سەرمای سەختی زستانی ئەوێم بیر دەکەوێتەوە...دەست لەبەر ئاگرەکە ڕادەگرم،دەڵێم ئۆخەی لەوەتەی هاتومە ئێرە گەرمم بۆتەوە...!مێشە

کەرانە هەرچەندە دۆزەخ زۆر ناخۆشە،بەلاّم لێرەش هێندێ شتی خۆش هەن...بۆ نمونە لێرە کێشەی نێوان خاوەن خانوو و کرێچی نییە.هەرگیز کەل و پەلی مالّی فەرمانبەر نابینی لەبەر قەرزاری هەراجیان بکەن.لێرە زۆر تاوانبار هەن بەرگەی گەرمی و ئازاری دۆزەخ ناگرن،ئەندام پەرلەمانێکی لێیە...هاواری کردووە:ئەگەر بێتو هەلّم بژێرن ولاّت دەکەم بە بەهەشت.بەلاّم دوای هەلّبژاردن خۆی لە هەوادارەکانی شاردۆتەوە،بۆ تەنها جارێکیش نەیان دیوە.

مێشە کەرانە چۆن لە دۆزەخی ژیانمدا تەنها جارێك چووم بۆ هاوینە هەوار...لێرەش بە هەمان شێوە ڕۆژێك بردیانین بۆ بەهەشت،بۆ ئەوەی بزانین ئەوانەی لە دنیا چاکەیان کردووە چۆن ئەوەی ڕاستێ بێ چووین بۆ بەهەشت،بەلاّم نەمانتوانی هەموو بەهەشت ببینین.بەلاّم لەو بەشەی کە من تێیدا گەرام کۆشکێکی گەورەم بینی. باسی جوانیەکەی بەدەم ناکرێ. لەناوەڕاستی باغێکی قەشەنگ و گەورەدا دروست کرابوو، هەرچوار دەوری بەگولّ داپۆشرابوو هەموو لایەك هەر ئاوو کانی بوو..

تابلۆی قەدەغەکراوی بەهیچ جۆرێك نەدەبینران... پرسیم ئەو کۆشکە جوانە کێی تێدا دەژی... گوتیان هی پیاوێکە کە لەدنی چاکەو خێری کردوە... خەستەخانەیەکی گەورەی بۆ نەخۆشی سیل دروستکردبوو... لێرە لەجیاتی ئەو چاکەیە ئەو کۆشکەیان پێداوە..

واتە پیاو لەژیاندا دەبێ چاکە بکا. چاکەش پارەی دەوێ،، گوومن باشە ئەو پیاوە ئەو پارەیەی لەکوێ هێناوە.

گوتیان تۆ دیارە لەکوێ گادا نوستووی لەوێ بەدەیان کارگەی هەبوون. تەنانەت کرێکارەکانی خۆی تووشی نەخۆشی سیل دەبوون. ئەو خەستەخانەیە بەخۆڕایی چارەسەر دەکران.

مێشە کەرانە گیان:کە گەڕاینەوە بۆ دۆزەخ پیاوێکی ئاسیاوی خۆمم بینی کە چەند ساڵێك دوای من مردبوو زۆر دڵم پێی کرایەوە.دەنگ و باسی دنیا و ئێوەم لێ پرسی:گووتی:چیم لێ دەپرسی؟گووتم:لە تاس و لە حەمام گووتی:تاس هەمان تاس و حەمام هەمان حەمام،ئێستە ئەو حەمامانە بوونەتە شوێنی ئاسەواری وڵات،نۆژەن کردنەوەیان قەدەغە کراوە.

خوشکی شیرینم مێشە کەرانە گیان:ئەوە کۆتایی و دوایین نامەی منە بۆ تۆی خۆشەویست،ئەو نامانە ڕەنگە لە دنیا بایەخێکیان هەبێ.کۆیان کەوە و بیانبە بۆ بەڕێوبەرە کۆنەکەم،تا بە چاپیان بگەیەنێ و بڵاویان بکاتەوە،لە قازانجەکەی پەنجا لیرە قەرزەکەی من هەڵگرێتەوە...مەگەر هەر ئاوا بتوانم قەرزەکەی خۆم بدەمەوە.خوا حافیزی هەمیشەییم و سلاوی کۆتایی دوایین نامەم پێش کەش بە بەڕێزت.

چاوەکانت ماچ دەکەم

سلاو.سلاوم بۆ زیندووە مردووەکان

ئەگەر تۆش مردی خوا عافوت بکات.

برات

((کەری تۆپیو))

کۆتایی



# کەری تۆپیو

لە ڕاستیدا ناسینی عەزیز نەسین کارێکی دژوار نیە ، بەهۆی ئەو شێوازە گاڵتە ئامێزییەوە دەتوانین لەگەڵ چیرۆکنووسەکانی دیکە جودای بکەینەوە .

عەزیز نەسین تاکە نوسەرە کە ئەتوانێت ژیانی نێو کۆمەڵ لەژێر کراسی شیرین خەندەوە بخاتە بەردەم خوێنەران .بەبڕوای من لەم کارەشدا سەرکەوتنی تەواوی بەدەست هێناوە چونکە ئەوەندەی من ئاگاداربم هەموو چیرۆك و ڕۆمانەکانی بەتەواوی زمانە زیندووەکانی دونیاوە وەرگێڕاون و خوێنەری تایبەتی خۆی هەیە

ئەم پەرتوکەش یەکێکە لەڕۆمانە ناوازەکانی عەزیز نەسین

HAREM



لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا